( لەمەعە)ی بیست‌وسێ‌هەم لە کتێبی ( لمعلر )

بەشێك
لە پەیامەکانی
نوور

# سروشت

# هونەرە یان هونەرمەند؟!

بدیع الزمان
سعیدی نوورسی

داینـــاوە

فاروق رسول یحیی

کردوویە بە کوردی

بەشێك لە پەیامەكانی نوور

# سروشت

## هونەرە یان هونەرمەند؟!


بدیع الزمان
سعیدی نوورسی
دایناوە

فاروق رسول یحیی
كردوویە بە كوردی

★ ئەم پەیامە بديـــع الزمـــان مامۆستا سعیلی نوورسی بە تورکی داینــــاوە .

★ مامۆستا « احسان قاسم الصالحي » کردوویە بە عەرەبی .

★ فاروق رسول یحیی لە عەرەبی‌یەوە کردوویە بە کوردی ، پاشـــان لەگەل تورکی‌یەکەیدا بەراوورد کراوە .

★ چاپی یەکەم

★ ١٤٠٦ هـ - ١٩٨٦م



★ چاپخانەی الحوادث بەغدا ت ٤١٥٢٦٨٥

بسم الله الرحمن الرحيم

قالت رسلهم أفي الله شك فاطر السموات والأرض

سورة ابراهيم ١٠

ئەم ئایەتە پیرۆزە بە بۆنەی ئەو پرسیارەی کە تیایدایەو بۆ مەبەستی ئینکاری کردنی هەڵوێستی بەرامبەر هێنراوەتەوە ، دەڵێ : گومان لـە بوونی خـوای گـەورەدا نییەو نابێ ، وە بەڵـگەیەکی بتـەوی گومـــان لێنەکراوی « بوون » و « یەکتایی »ی خوای گەورەیە • [ وە ئەمـەش تەنها بە تێرامان لـــە زەوی‌و ئاسمانەکان بـــە ڕوونی‌و بەداهـــەت دەردەکەوێ ] •

بەڵام پێش ئەوەی ئەم نهێنی‌یە ئاشکرا بکەین‌و ڕوونی بکەینەوە ، دەمانەوێ ئەمەی خوارەوە بخەینە پێش چاو :

لە ساڵی ١٣٣٨هـ (١٩٢٢ز)دا بانـگیان کردم بۆ ئەنقـەرە ، منیش ڕۆشتم ، وە لە ئەنقەرەدا دڵخۆشی‌و شادمانی‌ی ئیماندارانم بینی بە بۆنەی سەرکەوتنی سوپای ئیـسلامەوە بەسـەر یۆنانی‌یەکاندا •• بەڵام لە هەمان کاتدا تەماشام کرد بێ بڕوایی‌و ئیلحادو زندیقێتی ( الزندقة ) بە چەشنێکی ساماناك لـە جموجووڵدایەو خەریـکە لە ڕێـگای بەکـارهێنانی فڕوفێڵ‌و لەختە بردنەوە جێـگای چەمکەکان (المفاهیم)ی خـۆی لـــەناو دڵ‌و

دەروونو بیرو باوەڕی دامەزراوی ئیماندارانداء دەکاتەوە ، بۆ ئەوەی ئیمانداران لەخشتە بەنو بیروباوەڕیان زاراوی بکەن ٠٠

منیش کە ئەمەم بینیو هەستم پێ‌کرد ، لە ناخی دڵمەوە داخو خەفەت دایگرتمو ، لە دەست ئەم دێوە ساماکەی کە دەیەوێ پەلاماری بایەو بنچینەکانی ئیمان بدات ، هاوارو هانام بردە لای خوای گەورەی بەدەستەڵاتو پەنام بەم ئایەتە پیرۆزە بردو دەستم پێوە گرت ٠ ئەوە بوو نامیلکەیەکی بچووکم بە زمانی عەرەبی داناو لە چاپخانەی (ینی کون)ی ئەنقەرە لە چاپمداو بڵاووم کردەوە ، کە بەدیهی‌یەتی بوونی خوای گەورەو یەکایی‌ی ئەووم تیا چەسپاندبوو ، بە هۆی ئەو بەڵگە پتەوانەی کە لە نووری قورئانی پیرۆز وەرم گرتبوونو سەری ئەژدیهای زندیقێتیم پێ کوتابوونەوەو لەو نامیلکەیەدا باسم کردبوون ٠٠

بەڵام سەیرم کرد شوێنەواری ئەو بەڵگە پتەوانە لە بەرگری کردنی ئیلحادو زندیقێتیدا دەرنەکەوت ، چونکە ئەو نامیلکەیە کە چاپم کردبوو تا بڵێی کورت بوو ، سەرەڕای کەمی‌ی ئەوانەش کە زمانی عەرەبیان دەزانیو بایەخیان پێ دەدا ٠ لەبەر ئەمانە وەهەو خەیاڵەکانی ئەو ئیلحادە ـ بە داخەوە ـ پتر لە بڵاوبوونەوەو بەهێز بووندا بوون ٠ ئەمەش ناچاری کردم کە ئەو بەڵگانە بە زمانی تورکیو بە جۆرێکی درێژترو ڕوونتر سەر لە نوێ بنووسمەوە ٠ کە نووسیشمەوە ئەم پەیامەی بەر دەستی خوێنەر دەرچوو ٠

جا لەبەر ئەوەی هەندێك لەم بەڵگانە لە هەندێ پەیامی تردا ڕوون کراونەتەوە ، ئەوا لێرەدا بە کورتی باس دەکرێن ٠ هەندێکی تریش لەو بەڵگانەی کە لە پەیامەکانی تردا بڵاو بوونەتەوە ، لێرە دەرکەوتوونەتەوە ، وەك بڵێی هەر کام لەو پەیامانە بەشێکی ئەم پەیامەن ٠

# پێشەکی :

کاکی مرۆڤ !

بزانەو ئاگاداری ئەوە بە کە چەند ووشەیەکی ساماك هەن لە زاری خەڵکی‌یەوە دەردەچن‌و بۆنی بۆگەنی کوفریان لێوە دێت ، وە لە سەر زاری ئەهلی ئیمانیشدا تەشەنەیان کردووە ، بە بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن ، یاخود هەست بە بۆگەنی‌ی ئەو ووشانە بکەن .. وا ئیمەیش تەنها سیانی گرنگیان باس دەکەین :

یەکەمیان : ئەوەیە کە دەڵێن : « هۆکان دروستیان کردووە » ، واتە : هۆکان شت دروست دەکەن .

دووهەمیان : « لە خۆیەوە دروست بووە » ، واتە : هەرچی شت هەیە خۆی خۆی دروست کردووەو لە خۆیەوە پەیدا بووە ، هەر بەو چەشنەش کۆتایی‌ی پێ دێت .

سێهەمیان : « سرووشت داخوازی بووە » ، واتە : شتێکی سرووشتی‌یەو سرووشت بەدی‌ی هێناوە .

بەڵێ ، مادەم بوونەوەران ( الموجودات ) هەن‌و ، لە بەرچاوماندان بە چەشنێ کە هەرگیز وە بە هیچ شتێك ڕێگای سەرپێچی کردن لە

بوونیاندا نیه .. وە مادەم هەموو ئەو شتانەی لە بوونەوەردا هەن ، بەو پەڕی ڕێك‌و پێكی‌و حیكمەتەوە دێنە جیهانی « بوون » ، وە هیچ كامیشیان ئەزەلی نیە ، بەڵكوو هەموو تازەو دروست كراوون ..

مادەم ئەمە حاڵی بوونەوەرانە ، ئیتر تۆش ـ ئەی كاكی مولحید ! ـ تەنها چوار ڕێگات لەم مەسەلەیەدا لە بەردەمدایە :

یان ئەوەیە دەڵێیت : هەر شتێك لە جیهانی بووندایە ـ با بڵێین تازەلێك بێت ـ هۆكانی ناو ئەم جیهانە دروستی دەكەن ، واتە لە ئەنجامی كۆ بوونەوەی هۆ ماددی‌یەكانەوە بوونی دەست دەكەوێت ..

یان دەڵێیت : خۆی لە خۆیەوە پێك هاتووە ..

یان دەڵێیت : لەسەر داخوازی‌و بە كاریگەری‌ی سرووشت دێتە ناو جیهانی بوونەوە ..

وەیان ئەوەیە باوەڕت بە هیچ كام لەمانە نیە ، ئەو كاتە دەبێ بڵێیت : « توانستی خواوەندی بەدیهێنەری بە توانا دروستی دەكات‌و بوونی پێ دەبەخشێ » .

چونكە بە پێی ئەرازووەكانی زیری جگە لەم چوار ڕێگایە هیچ ڕێگایەكی‌تر لە گۆڕێدا نیە بۆ لێكدانەوەی دروست بوونی بوونەوەران .

جا ئەگەر بە شێوەیەكی بێ گومان ئەوەمان بۆ چەسپا كە سێ ڕێگاكانی پێشوو بەتاڵ‌و مەحاڵ‌و نەگونجاوون ؟ ئەوا بە پێی زەرووورەت‌و بەداهەت ڕێگای چوارەم دەچەسپێ ، كە بریتی‌یە لەو ڕێگایەی « بوون » و « یەكایی »ی بەدیهێنەر بە چەشنێكی بێ گومان دەچەسپێنێ .

# ڕێگای یەکەم

ڕێگای یەکەم ئەو ڕێگایەیە کە دەڵێ : « کۆبوونەوەی هۆکانی جیهان دەبنە هۆی دروست بوونی بوونەوەران‌و ئەو شتانەی لە بوونەوەراندا هەن » ◦

ئێمەش لە نێوان ئەو مەحاڵە زۆرانەی کە لەم ڕێگایەدا هەن ، تەنها سیانیان باس دەکەین :

**مەحالی یەکەم :**

هەر دەرمانخانەیەك بگریت سەدان شووشەی پڕ لە ماددەی جۆراوجۆری تێدایە ◦◦

جا ئەگەر بێت‌و پێویستی‌یەك هاتە ئاراوە بۆ پێکهێنانی هەویرێکی زیندەکاری ( معجون حيوي ) لەو ماددەو دەرمانانە ، وە پێویست بوو ماددەیەکی زیندەکاری دژ بە ژەهرەکانیان لێ پێك بهێنرێ ◦ با وا دابنێین پێویستی‌یەکی وا ڕوویداو بۆ ئەم مەبەستە ڕۆشتینە ناو دەرمانخانەیەك ◦◦

جا کە چووینە ناو ئەو دەرمانخانەیە ، چەندین جۆرمان لەو

هـەویرە زیندەکاری یەو لـەو ماددە زیندەیەی کە دژ بە ژەهرەکانە تیـا دەسکەوت • پاشان کـە دەستمان کرد بە شیتەڵ کردنی هەر کام لـەو هەویرانە ، بۆمان دەرکەوت کە هەر یەکەیان بەو پەڕی ووردی یەوە لە چەند ماددەیەکی جیا جیای ناو ئەو شووشانە ، وە بە پێی تەرازوویەکی دیاری کراو پێك هـاتووەو پوختـە کراوە : گرامێك لەم دەرمانەو سیان لەو و شـەش حەوتێ لەوی تر ، بەم جۆرەو لە هـەر کام لەو دەرمانانە ئەندازەیەکی تایبەتی یان لێ وەرگیراوە ، بە جۆرێك کە ئەگەر بهاتایەو بە ئەندازەی بەشێك لـە یەك گرام زیاتر یان کەمتر بووایە ئەو ئەدگارە زیندەکاری یەی تیا پەیدا نەدەبوو ••

پاشان ئەو ماددە زیندەکاری یەی کـە دژ بە ژەهرەکانە ، هێنامانو لێی وورد بووینەوە ، بۆمـــان دەرکـــەوت کـە ئەویش بە چـــەند ئەندازەیەکی دیاری کراو و بـە پێی چـەند تەرازوویەکی هەستیار پێك هێنراوە ، کـە ئەگـەر بهاتایەو بە قەدەر گەردێك زیاد یان کەم بووایە ، ئەوا تایبەتـکاری یەکانی خۆی لە دەست دەدا • واتـە ئەو مـاددە جیـا جیایانە بە چـەند ئەندازەیەکی جیا جیاو بە چەند تەرازوویەکی هەستیارو وورد ئامادە کراوون •

جا ئایا دەچێتە عەقڵی هیچ خاوەن عەقڵێکەوە کـە ئەو هـەویرەی ئاوا بـەم چەشنە هـــەموو بەشێـکی بـە ووردی حساب کراوەو لێك دراوەتەوە ، بە هۆی ڕێـکەوتێـکی سـەیرەوە پەیدا بووبێت ، یان لـە ئەنجامی هەڵـکردنی ڕەشەبایەك بەسەر ئەو دەرمانخانەیەدا ئەو شووشانە کەوتبن بە سەر یەکـداو ئەو ئەندازە دیاری کراوانەی ئاوێتـەی یەکتر کردبێو بەم جۆرە ئەو هەویرە زیندەکاری یەی پێك هێنابێ ؟!!

ئایا مەحاڵی لەمە سەیر ترو ، خورافەتی لەمـە خراپترو ، ناحـەقی

لەمە ناحەق‌و ناڕەواتر هەیە ؟ بگرە ئەگەر بێت‌و کەرێتی‌ی کەر چەندین ئەوەندەی خۆی زیاد بکات‌و ، پاشان کالآی مرۆڤانە لەبەر بکات ؟ ئەوا هەتا لە توانایدایە لە دەس ئەم کەرێتی‌یە هەڵدێت‌و ڕەفزی ئەم جۆرە بیرکردنەوە نزم‌و سەرشۆڕکەرانە دەکات !!

جا لە ڕووناکی‌ی تیشکی ئەم نموونەیەدا دەڵێین :

هەر زیندەوەرێك بگری ، بریتیە لە پێکهاتوویەکی زیندەکارو هەویرێکی خاوەن ژیان ، وە هەر ڕووەکێکیش وەك دەرمانێکی زیندەکاری دژ بە ژەهران وایە ، چونکە لە چەند بەش‌و ماددەیەکی جیا جیاو بە پێ‌ی چەند تەرازوویەکی تا بڵێ‌ی ووردو هەستیار پێك هێنراوە ، هیچ گومانیش لەوەدا نیە کە گێڕانەوەی دروست بوونی ئەم زیندەوەرە جوان‌و پڕ لە ووردەکاری‌یە ، بۆ ماکەکان هۆ ماددی‌یەکان ، شتێکی بەتاڵ‌و مەحاڵ‌و نەگونجاوە‌و لە هەموو تەرازوویەکی عەقڵی‌یەوە تا بڵێ‌ی دوورە ، بە چەشنی مەحاڵی‌ی پێك هاتنی ئەو هەویرە زیندەکارە لە ڕێگای تێکەڵ بوونی ئەو ماددانەی ناو شووشەکان لە خۆیانەوە .

بە کورتی :

ئەو ماددە زیندەکارانەی کە بە تەرازووی قەزاو قەدەری خاوەندی زانای دانا لەم جیهانەدا ـ کە وەك دەرمانخانەیەکی گەورەو بێ وێنە وایە ـ ئامادە کراوون ؟ تەنها بە حیکمەتێکی بێ کۆتایی‌و زانستێکی بێ سنوورو ویستێکی گەورەی دەستەڵاتدار نەبێ هەرگیز دروست نابن .. دەنا ئەو کەسەی کە دەڵێ : « ئەو شتانەی لە بوونەوەردان بەرهەمی ماکە هاتوچۆکەرو کەڕو کوێرو لافاو ئاساکانی بوونەوەرن ، یان لە سرووشتی شتەکاندان ، یان هۆ ماددی‌یەکان بەرهەمی هێناوون » ئەو کەسەی قسەی وای لە دەم دەردەچێ ؟ دەبێ لەو بەڕێ

نەفامیدا بێتو لەو سەرخۆشە مەستە بێ عەقڵتر بێت کە دەڵێ : ئەو دەرمانو هەویرە سەیرە لە ئاکامی لەیەك کەوتنو تێکەڵ بوونی ماددەکاندا دروست بوون •

ئایا ئەو کوفرەی کە لەم قسانەدا هەیە بەڵگەی ئەوە نیە کە ئەو کەسەی دەیانکات لەو پەڕی شێتیو سەرخۆشیو بێ عەقڵیدایە ؟!

**مەحالی دووهەم :**

ئەگەر بەدیهێنانی هەموو شتێك لە بوونەوەردا بۆ خوای تاكو تەنهای خاوەن گەورەیی‌و دەسەڵات نەگێڕرێتەوە ، وە بدرێتە پاڵ هۆ ماددییەکان ؛ ئەوا ئەو کاتە دەبێ زۆربەی ماکەکانی بوونەوەرو هۆکانی لە هەموو خاوەن ژیانێکدا دەخڵو کاریگەرییان بێ • کەچی کۆ کردنەوەی هەموو هۆ دژ بە یەكو جیا جیاکان بە ڕێكو پێکییەکی تەواو • وە بە تەرازوویەکی تایبەتی لە لەشی دروستکراوێکی وەك مێشدا ، ئەوەندە شتێکی مەحاڵە کە هەر کەسێك بە ئەندازەی باڵە مێشێك دارای ژیری بێت بە ئاشکرا ڕەتی دەکاتو پڕ بە دەم دەڵێت : ئەمە شتێکی مەحاڵو بەتاڵەو هەرگیز ناگونجێ •

چونکە تەنی بچووکی مێش لەگەڵ زۆربەی ماکەکانی بوونەوەرو هۆ ماددییەکانیدا پەیوەندیدارە • بگرە لە ڕاستیدا کورتەو پوختەیەکی ئەو ماکانەیە • جا ئەگەر بەدیهێنانو دروستکردنی مێش بۆ توانستی ڕەهای خوا نەگێڕرێتەوە ، ئەوا ئەو کاتە دەبێ هەموو هۆ ماددییەکان لە کاتی دروستکردنی ئەو مێشەدا یەکسەر بە کۆمەڵی لە تەنیشتیدا ئامادە بن ، بەڵکوو دەبێ بچنە ناو تەنە لاوازەکەیەوە ، بەڵکوو لەوەش زیاتر • دەبێ بچنە ناو هەموو خانەو یەکەیەکی

پێك هاتن لە لەشی ئەو مێشەدا • چونكە مۆكان ئەگەر ماددی بن ئەوا دەبێ لە نزیكو لە ناو شتە كارتێكراوەكانیاندا ئامادە بن • خۆ ئەگەر ئەمەش ڕوویدا،ئەوا دەبێ چوونی هەموو ماكە دژ بە یەكەكانی بوونەوەر بە ڕێكو پێكی‌یەوە بۆ ناو ئەو خانەیەی كە تا بڵێی ووردو بچووكە ؟ دەبێ ئەمەش لە چوارچێوەی ژیریدا بە شتێكی ڕەوا بزانین !

بەم جۆرە بۆمان دەركەوت ئەم ڕێڕەوە بە چەشنێكە كە بێ عەقڵترین‌و گێلترین كەسیش لە پێڕی سۆفستائی‌یەكان[1] شەرمی لێ دەكات‌و هەرگیز نایگرێتە بەر •

**مەحالی سێهەم :**

ئەگەر بوونی بوونەوەران ( لە بارەی ڕێكو پێكی‌و ، لەگەڵ یەك گونجانو ، شكڵو شێوەیانەوە ) لەسەر یەك ڕەوەت بوون ، ئەوا

---

(١) سۆفستائی‌یەكان تاقمێك بوون لە فەیلەسووفەكانی پێش « سوقرات » لە یۆناندا - ئینكاریی حەقیقەتی شتانیان كردووەو لایان وا بووە كە حەقیقەتی هەرشتێك سابت‌و دامەزراو نیە • ( جۆرجیاس )و ( برۆتاجۆراس ) بەناوبانگترینی فەیلەسووفە سۆفستائی‌یەكانن • ئەم تاقمەش لەناو خۆیاندا چەند بەشێكن ، كاتی خۆی « سوقرات » زۆر بە توندی ڕەددی داونەتەوە • بەڵام ئەوەندە هەیە كە ئەم جۆرە كەس‌و بیروڕایانە لە هەموو سەردەمێكدا بە كاڵای نوێ‌و ناوی جۆراو جۆرەوە پەیدا دەبنەوە •• بۆ زیادە ئاگاداری سەیری ئەم سەرچاوانە بكە : « شرح العقائد النسفیة » لسعد الدین التفتازانی ص ٢٣ ـ ٢٥ طبعة تركیا سنة ١٣٢٦ هـ •• « كشاف اصطلاحات الفنون » للتهانوي ج ١ ص٦٦٥ طبعة كلكته عام ١٨٦٢ م •• « الموسوعة الفلسفیة المیسرة » ج ١ ص ١٠٣٤ طبعة دار نهضة لبنان / بیروت سنة ١٩٦٥م •

( وەرگێر )

دەبێ یەك دەست دروستی کردبێتن ، بە پێی ئەو قاعیدە ئاشکرایەی کە دەڵێ : « تاك » تەنها لە تاکەوە دەردەچێ » •

جــا ئەگــەر هات و ئەو بوونەوەرە لــەو پــەڕی ڕێك و پێــکی و وردەکاریدا بێت و ، بە تەرازوویەکی ورد بەدیهێنرابێ و ، خــاوەنی ژیانێــکی گشتی بێت ؛ ئەوا بە ئاشکرا ئەوە دەگەیەنێت کــە چــەند دەستێــکی جیا جیا کاریان تیا نەکردووە • چونــکە ئەوە دەبێتە هــۆی داکۆکی و جیاوازی لە نێوانیاندا • بەڵــکوو ئەوە دەردەخات کە تەنهــا دەستکردی یەك کەسی بە تواناو خاوەن حیکمەتە •• جا لەبەر ئەمــە ، گێڕانەوەی بەدیهێنانی ئــەم بوونەوەرە ڕێك و پێك و تاك و بە تەرازەووە بۆ دەستی هۆ سرووشتی‌یە کەڕو کوێرو بێ گیانەکان ( ئەو هۆیانەی کە هیچ هەست و هۆشێــکیان تێــدا نیــەو ، داکوکی و جیــاوازی‌یەکەی نێوانیشیان پتر پەرە بە کــەڕی و کوێری‌یان دەسێنێ ) • پاشان ئیدیعــا کردنی ئەوەی کــە ئەم هۆیانەن هەڵدەستن بە بەدیهێنانی ئەو بوونەوەرە ڕێك و پێــکەو هەڵبژاردنی لــە نێوان چــەند گونجان و ئیحتیمالێکی لــە ژمــارە بەدەردا ؛ گێڕانەوەی دروست بوونی ئەم بوونەوەرە بۆ ئـــەو هۆیانەو ، ئیدیعا کردنی ئەمــە ، لە ڕاستیدا  بریتی‌یە لە قبوولــکردنی ســەد مەحــاڵ • وە ئیدیعایەکــە تا بڵێی لــە هەموو تەرازوویەکی ژیری‌یەوە دوورەو هەرگیز عەقڵ وەری ناگرێ •

وەرە با واز لــەم مەحاڵە بێنین • • با سەیرێکی کاریگەری‌ی ئەو هۆیانەبکەین کە بە لێك کـــەوتن ( التماس ) ڕوودەدات ، ئەوەتا ئــەو لێك کەوتنە تەنها لێك کەوتنێــکە لە ڕواڵــەت و ڕووی دەرەوەی ئــەو بوونەوەرە زینــدووە • کەچی دەبینین ناوەوەی ئەو بوونەوەرە کــە هەرگیز دەستی هۆماددی‌یەکان ناتوانن بیگەنێ ؛ زۆر زۆر لە وێنـــەی

دەرەوەی ئەو زیندەوەرە ڕێکو پێکترو ئاڵۆزترەو تا بشڵێی ناسکو نەواوترە • بگرە ئەو زیندەوەرە بچووکو ووردانەی کە هەرگیز هۆ ماددییەکان ناتوانن بیانگرنە خۆو بە هیچ جۆرێ دەستیان ناگاتێ ؟ زۆر سەیرترو ڕێکو پێکترن لە بوونەوەرە هەرە گەورەکان •

کەواتە ئیتر گێڕانەوەی دروست کردنیان بۆ لای هۆ کەڕولاڵو ڕەقو تەقو نەستوورو نەزانو دوور لە عەقڵو دژ بە یەکەکان ، تەنها لەو بەڕی کەڕو کوێری‌یەوە نەبێ لە هیچی ترەوە نیە !

## ڕێگای دووهەم

مەسەلەی دووهەمیش کە بریتی‌یە لە ڕستەی ( خۆی لە خۆیەوە پێك هاتووە ) ئەویش هەروەها چەندین مەحاڵی زۆری تێدایە ، وە لە چەند لایەنێکی زۆرەوە دەردەکەوێ کە شتێکی نەگونجاو و بەتاڵە . بەڵام ئێمە تەنها سیان لەو مەحاڵانە بۆ نموونە باس دەکەین :

**مەحاڵی یەکەم :**

ئەی سەرکەشی کەللەڕەق !

ئەو سەرکەشیو لەخۆ بایی بوونەت تۆی خستۆتە ناو باوەڕی بێ عەقڵی‌یەکی تا بڵێی زۆرەوە ، تا وای لێ کردوویت کە باوەڕ بە سەد مەحاڵ بکەیت !

ئەی برای مرۆڤم ! بە بێ هیچ گومانێك تۆ هەیت ، هەروەها گومان لەوەشدا نیە کە تۆ ماددەیەکی ساکاری ڕەق نیت تا ئاڵو گۆڕت بەسەردا نەیەت ، بەڵکوو کارگەیەکی گەورەی ڕێك‌و پێکی لەوتۆیت کە ئامێرەکانت هەردەم لە تازەبوونەوەدان . هەروەها وەك کۆشکێکی گەورە وایت کە هەردەم لایەنەکانی لە جمو جووڵ‌ دا

فراوان بوونو تازەبوونەوەدان ، چونکە خانەکانی لەشت بە بێ هیچ وەستانێك هەمیشە لە کارو کۆششدان ، وە پەیوەندییان لەگەڵ ڕواڵەتەکانی بووندا لە بوونەوەری دەوروبەرتدا هەیە . کەواتە هەمیشە لە بەخشینو وەرگرتندایە لەگەڵ بوونەوەراندا ، بە تایبەتی لە لایەنەکانی ڕۆزیو مەسەلەی مانەوەی جۆر (نوع)ی ئینسانییەوە .

ملیۆنەها خانەی کارگوزاری ناو جەستەت لە کارکردن ناوەستنو خەریکی پارێزگاری کردنی بەردەوام بوونی کارلێکەکانی نێوان خۆیانو ئەو وردەکارییانە دەبن کە لە نێوانیاندا هەیە . وە لە هەوڵی ئەوەدان کە هەرگیز پەیوەندییەکانی نێوانیان نەبچڕێت . واتە زۆر بە لەسەرخۆییو مەترسییەوە ئەم کارانە دەکەنو هەڵوێستێکی وا دەگرن کە ئەگەڵ ئەو پەیوەندییانەی نێوانیان گونجاو بێت . وەك بڵێی ئەم خانانە سەیری هەموو بوونەوەران دەکەن تا جێگای تۆی تیا ببینن ، بە جۆرێك هەڵسوکەوت بکەن کە سوودی تۆی تیا بێ . . ئیتر تۆیش لە جێگای خۆتداو بە پێی ئەو حاڵەتانەی کە ئەو خانانەی لەشت تیایدان ، سوود وەردەگریو لەزەت لە هەستە دیارو نادیارەکانت دەبینی .

جا ئەگەر باوەڕت وا نەبێ کە ئەو خانانەی لەشت بریتین لە چەند فەرمانبەرێکی بچووك لە لایەن خواوەندی بە دەسەڵاتی ئەزەلیو چەند کاربەسێرراوێکی گوێڕایەڵ بۆ یاساکانی خوا ، یان چەند سەربازێك لە سوپای ڕێكو پێکی خوادا ، یان نووکەکانی قەڵەمی قودرەتی خوا ، یان چەند نوختەیەك کە قەڵەمی توانستی خوا دەیانکێشێو دەیاننووسێ ؟ ئەگەر باوەڕت وا نەبێ ، مانای وایە دەبێ باوەڕت وا بێت کە هەرچی خانەی کارگوزار (بۆ نموونە لە چاوتدا) هەن ، جەریەکەیان

چاوێـکی فراوانی پـنەری ئەوتۆی هـەیە کە هەموو بەش و لایەنەکـانی لەشت دەبینێ و چاوی لـــە هەموو ئەو بوونەوەرانەیە کـــە پەیوەندیت لەگەڵیاندایە ، وە ئاگـاداری ڕابوردوو و تێـتاو ئایندەی تۆیەو ، باوك و باپیرو بنەچەت لەگەڵ منداڵ و بەرەو وەچەکانت دەناسێت و ، سەرچاوەی ئەو ماکانەی تۆی لێ پێك هاتوویت و ئەو خەزێنانەی کە ڕۆزیی تۆیان لێوە دێت ، هەموو دەزانێ .. کەواتە بەم پێیە هەرچی خانەی کارگوزار لە جەستەتدا هەن هەریەکەیان خاوەنی عەقڵ و ژیرییەکی گەورەیە !!

جا ئەی ئەو کەسەی کە باوەڕی بەشتیواهەیەو ، لە ڕاستیدا بـــە ئەندازەی یەك خانە دارای ژیری نیـە !

ئایا نیسبەت دانی ئەم هەموو عـــەقڵ و شعوورو ژیرییەی کـــە ملیۆنێك ئەفلاتوون نیـانە ، نیسبەت دانی ئـەم هەموو عـەقڵ و شعوورو ژیریە لـە گـەردیلەیەکی جەستەی خـــۆت ، ئەفسانەو ســەرشێتی و بێعەقڵییەکی لەڕادە بەدەر نیـە ؟

**مەحالی دووهەم :**

ئەم بوونەی تۆ وەك کۆشکێکی گەورەی ئاوەدان وایە کە هـەزار گومەزی تیا بێت و ، هەریەك لەو گومەزانەش بە ڕێك و پێکی و بـــە بێ هیچ ستوونێك یەکیان گرتبێت و چەندین بەردیان پیا هەڵواسرابێ . بگرە جەستەی تۆ هەزار ئەوەندەی ئەم کۆشکە سەرسوڕهێنەر ترە . چونکە کۆشکی جەستەت هەمیشە بەرەو جوانتر دەڕوات و زۆر بە ڕێك و پێـــکی لە تازەبوونەوەدایە .

خۆ ئەگەر بێت و سەرنج لەو ڕۆحە نەدەین کە لە تۆدایەو خـۆی لـە خۆیدا موعجیزەیەکی سەربەخۆیە ، هەروەهـا لەو دڵ و (لطائف)،

مەعنەویيانەتی کە لە تۆدان ؟ ئەگەر سەرنج لەمانە نەدەین و تەنها یەك ئەندام لە نێوان ئەندامەکانی لەشتدا بگرین ، ئەوا دەبینین ئەو ئەندامە وەك خانوویەك وایە کە چەند گومەزێکی تیا بێ ، چونکە ئەو خانانەی کە لەو ئەندامەدان وەك بەردی گومەز بەو پەڕی ڕێك و پێکی و جوانی و ووردەکاری یەوە یەکیان گرتووە و بینایەکی تا بڵێی جوانیان پێك هێناوە ، وە بەمەش یەکێك لە موعجیزەکانی دەستەڵات و توانستی خواوەندیان ( وەك چاو یان زمان ) دەرخستووە ..

جا ئەگەر ئەم خانانەی لەشت لە لایەن خواوە کاری سپێرراو نەبن و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خواوەندی بەدیهێنەر نەبن ؟ ئەو کاتە دەبێ هەریەك لەو گەردیلانە بە سەر ئەوانی تردا فەرماندەرێت و لە هەمان کاتیشدا فەرمان بە سەردادراوی ئەوان بێت ! واتە لە ڕوانگەی دەستەڵات و فەرماندەرییەوە لەوانی تر بچێت و کەچی دژیشیان بێت ! وە دەبێ زۆربەی ئەو سیفەتانەی کە تەنها شایستەی خوان ، لەو ئەتۆمەدا بن . وە دەبێ لە یەك کاتدا سەربەستیش و دەست بەسراویش بن !

جا هەرکەس بە ئەندازەی ئەتۆمێك شعووری بێ ، دەزانێ کە هەرگیز ناگونجێ بەدیهێنانی ئەو بەدیهێنراوە ڕێك و پێکە ( کە یەکێکە لەو شوێنەوارانەی پەنجە بۆ تاك و تەنهاییی بەدیهێنەریان درێژ دەکەن ) بدرێتە پاڵ چەندین خانەی زۆرو لەژمارە بەدەر . بەڵکو کە بیر لەمە دەکاتەوە سەد مەحاڵی تیا دەبینێ .

**مەحاڵی سێهەم :**

ئەگەر ئەم جەستەیەی تۆ بە قەڵەمی خواوەندی تاك و تەنها و خاوەن توانستی ئەزەلی نەنووسرابێت و ، لە چاپخانەکانی سرووشت و

هۆکاندا لە چاپ درابێت ، ئەوا دەبێ ـ لەو حاڵەتەدا ـ بە ئەندازەی ژمارەی ئەو پێکهاتووە رێك‌و پێکانەی جەستەت ، هەر لە بچووکترین خانەی کارگوزاریەوە تا دەگاتە گەورەترین‌و فراوانترین ئامێری کرکێتی تیایدا ، قاڵبی سرووشتی بێن بۆ دروستکردن‌و بەدیهێنانیان ..

با ئەم کتێبەی بەر دەستمان بە نموونە بهێنینەوە تا لەم مەحاڵە تێ بگەین :

ئەم کتێبە بە دەست نووسراوەتەوە ، کەواتە نووسەرەکەی تەنها یەك دانە قەڵەمی بەسە تا بیگرێ بە دەستەوەو ئەوەی مەبەستی‌یەتی بە زانیاری‌ی خۆی بۆی بنووسێتەوە . بەڵام ئەگەر وا نەزانرێ کە تەنها بە یەك قەڵەم‌و بە دەستی یەك نووسەر نووسراوەتەوە ، وە وا دابنرێ کە خۆی لە خۆیەوە پێك هاتووە ، یان بە کردەی سرووشت دابنرێ ؟ ئەوا دەبێ هەر پیتێکی ئەو کتێبە قەڵەمێکی کانزایی‌ی تایبەتی خۆی بێ . واتە وەك ئەو پیتە کانزایی‌یانەی کە لە چاپخانەکاندا هەن‌و بە ئەندازەی ژمارەی پیتەکان‌و بە گوێرەی شێوەو شکڵیان ؟ دەبێ وەك ئەمە ، بە ئەندازەی پیتەکانی ئەم کتێبەو شێوەو شکڵیان قەڵەم بۆ ئەم مەبەستە بێ . بە واتایەکی تر : لە بری یەك دانە قەڵەم بۆ نووسینەوەی ئەم کتێبە ، دەبێ بە ئەندازەی پیتەکانی خۆی قەڵەم بێ .

کاتی واش دەبێ هەندێك لەو پیتانە بە ئەندازەی لاپەڕەیەکی تەواو شتی تیا نووسراوەتەوە . جا لە حاڵەتێکی وادا دەبێ بۆ نووسینی ئەم جۆرە پیتە گەورانە هەزاران قەڵەمی وورد بێن تا ئەو پیتانە بنووسن ..

جا ئێستاش ئەگەر ئەو پیتانە بە جۆرێکی رێك‌و پێك یەکیان گرتبێ‌و چوو بێن بەناو یەکتریداو شێوەو شکڵی جەستەی تۆیان وەرگرتبێت ؟ دەبێ لە هەر بەشێك لە بەشەکانی جەستەتداو لە هەر

فەرمانگەیەکیدا . بە ئەندازەی ئەو پێکهاتووانەی لە ژمارە نایەن قاڵب هەبن تا پێکیان بهێنن !

وا دابنێ لەم حاڵەتەشدا کە مەحاڵێکەو سەد مەحاڵی تری لێ دەبێتەوە ، تۆ دێیتو دەڵێیت : دەگونجێ ڕوو بدات .. بەڵام ئایا لەم کاتەشدا ـ واتە کە نووسینی کتێبەکە ئەگێڕدرێتەوە بۆ یەك قەڵەم ـ خودی ئەو قەڵەمو پێتە کانزایی‌یانە پێویستیان بە چەند قەڵەمو قاڵبو پێتێك نابێ بە ژمارەی خۆیان تا دروستیان بکەن ؟ چونکە ئاشکرایە کە هەموویان دروستکراونو پێویستیان بە بەدیهێنەرو دروستکەرێك هەیە تا بەدیان بهێنێو دروستیان بکات ..

ئیتر بەم جەشنە تا درێژەی پێ بدەیتو لێی بکۆڵیتەوەو پتر لێی توول بیتەوە ؟ ئەوا زیاتر درێژە دەکێشێو زنجیرە لە دوا زنجیرەی تری لێ دەبێتەوە !

دەسا تۆیش لە ڕوانگەی ئەم نموونەیەوە لە ڕادەی لاوازیو هەڵەیی ئەم بیروڕایە تێ بگە کە بە ئەندازەی خانەکانی جەستەت خورافەتو مەحاڵی تێدایە ..

جا ئەی ئەو کەسە سەرکەشو کەللەڕەقەی کە عەقلی خۆی لە کار خستووە !

تۆش شەرم بکەو واز لەم گومڕایی‌یە بهێنە .

# ڕێگای سێهەم

ووشەی سێهەمیش کە دەڵێ : « سرووشت داخوازی بووە » واتە لەسەر داخوازی سرووشت هاتۆتە دی ، ئەم حوکمەش چەندین ئەحالی زۆری تێدایە ، بەڵام تەنها سیانیان بۆ نموونە باس دەکەین :

**محالی یەکەم :**

ئەگەر بێت و ئەو ڕێك و پێکی و بەدیهێنانەی کە لە ناو بوونەوەران بە تایبەتی زیندەوەراندا بە ئاشکرا دەبینرێن ، وە حیکمەت و بەصیرەتیان بە جوانی تیا بەدی دەکرێ ، ئەگەر بێت و ئەمانە بۆ قەڵەمی قەدەر و توانستی خوا نەگێڕرێنەوە ، بدرێنە پاڵ سرووشتی کێل و ویل و کەڕ و لاڵ ، یان هێزی ئەو سرووشتە بێ هەستە ، ئەوا دەبێ سرووشت لە هەموو شتێکدا چەندین کارگەو چاپخانەی لە ژمارە بەدەر دروست بکات ، یان لە هەموو شتێکدا تواناو دەسەڵاتێکی ئەوتۆ دابنێت کە بتوانێ هەموو بوونەوەر ( الکون ) درووست بکات ، وە حیکمەتێکی کارگێڕی کارامە لە هەموو شتێکدا بەدی بهێنێ بۆ بەڕێوە بردنی کاروبارەکانی بوونەوەر .

بۆ نموونە :

درەوشاندنەوەی تیشکی خۆر کە لەسەر هەموو دڵۆپە ئاوەکان‌و لەسەر ووردە شووشە پەرش‌و بڵاوەکاندا دەردەکەوون ، وەکوو چەند خۆرێکی بچووك لە بەر چاودا خۆیان دەنوێنن ۰ جا ئەگەر ئەم درەوشاندنەوەو تیشکدانەوانە نەگێڕینەوە بۆ ئەو خۆرە ڕاستەقینەو تیشکدارە ، ئەوا دەبێ باوەڕ بەوە بکرێ کە لە هەموو دڵۆپە ئاوێك‌و پارچە شووشەیەکدا خۆرێکی ڕاستەقینەو سرووشتی بێ ، کە هەموو سیفەت‌و ئەدگارەکانی خۆری ڕاستەقینەی ناو جەرگەی ئاسمانی تیا بێت ۰ واتە : دەبێ باوەڕ بەوە بکرێ کە بە ئەندازەی ئەتۆمەکانی ئەو پارچە شووشانە خۆری ڕاستەقینە لەو شووشانەدا بێ !

ئێستاش لەبەر ڕووناکی‌ی ئەم نموونەیەدا دەڵێین :

ئەگەر بەدیهێنانی بوونەوەران‌و زیندەوەران یەکسەر نەدرێتە پاڵ درەوشاندنەوەی ناوە جوانەکانی نووری ئەزەلی ، کە خوای گەورەی بەدەستەڵاتە ، ئەوا دەبێ باوەڕ بە سرووشتێکی ئەوتۆ بکرێ کە لە هەموو بوونەوەرێکدا ( بە تایبەتی لە زیندەوەراندا ) ویستێکی ڕەهاو زانستێکی ڕەهاو حیکمەتێکی ڕەهای بێ ۰ واتە دەبێ باوەڕ بە بوونی خوایەك لە هەموو بەشێکی بوونەوەردا بکرێ !!

خۆ دیارە ئەم جۆرە بیرکردنەوە نەزۆکانە لە هەموو مەحاڵێکی تر بەتاڵترەو پتر خورافەتی تێدایە ۰

بێ گومان ئەو کەسەی کە ئەم هەموو سنعەت‌و ووردەکاری‌یانەی خوای گەورە ـ کە لە بچووکترین شتیشدا بە ئاشکرا دەبینرێ ـ دەگێڕێتەوە بۆ سرووشتێکی وەهمی‌و بێ بایەخ‌و هەست‌و شعوور ، مانای

وایە بەم کردارەی وای لە خۆی کردووە کە بەرەو نزمترین پلەی لــە ئاژەڵ پەست تر دەڕواو نزم دەبێتەوە • واتە نەك وەکوو ئاژەڵ بەڵــکوو خراپتریشی بەسەر دێت •

**مەحالی دووەمم :**

ئەگــەر ئەم بوونەوەرانەی کە لەو پەڕی ڕێکوپێکیو جوانیــدانو دارای وووردەکاریو حیکمەتی تەواو و ڕێکو پێــکن ، بۆ یەکێــکی بــە دەستەڵاتی خاوەن توانستی ڕەهــاو حەکیمی خــاوەن حیکمەتی ڕەهــا نەگێڕرێنــەوە ، وە لــە بری ئەمــە بدرێنە پاڵ سرووشتو بـــە کردەی سرووشت بزانرێن ، ئەوا دەبێ ئــەم سرووشتە لە هەموو مشتێك خۆڵدا ـ کــە کارگەو شەتلــگای گوڵو بەروبوومەکانە ـ بە ئەندازەی ژمارەی کارگەو چاپخانەکانی ئەورووپا کارگەو چاپخانە ئامادە بــکات ، تا ئـــەو مشتە خۆڵە بۆی بڕەخسێ بــەم چەشنە ببێتە کارگەی ئەو گوڵە جوانو بەروبوومە ئاسكو بەلەزەتانە ••

چونــکە ئەو مشتە خۆڵەی کــە وەك شەتلــگایەکی بچووك وایە ، تواناو قابیلیەتێــکی ڕاستەقینەی ئەوتۆی تێدایە کە ئەگەر بێتو هەرچی تۆوی گوڵو بەروبوومە جیا جیاو جۆراو جۆرو ڕەنــگاو ڕەنــگەکانی بوونەوەر هــەن ، بە نۆرەو بە جیا جیا لــەو مشتە خۆڵەدا بچێنرێن ، ئەوا هەموویان سەوز دەکات ••

جا ئەگــەر ئەم تواناو قابیلیەتە بۆ توانستێکی بەدیهێنەرو بۆ ئــەو خواوەندە گــەورەیە نەگێڕرێتەوە کــە دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە ، مانای وایە دەبێ لــەو مشتە خۆڵەدا بۆ هەر یەکە لەو گوڵانەی کە لە دنیــادا هــەن مەکینەیەکی تایبەتیو مەعنەویی سرووشتی بێ ! دەنا

هەرگیز ئەو هەموو گوڵو بەرو بوومە جۆراو جۆرانەی دەیانبینین بەیدا نابن و نایەنە جیهانی بوونەوە . چونکە تۆوەکان ـ وەك ئاوی مەنیو هێلکەکان ـ ماددەکانیان لە یەك دەچن کە بریتین لە ئۆکسجینو هایدرۆجینو کاربۆنو ئازۆت ، کە بە چەند شێوەو شکڵێکو بە چەند رێژەیەکی جیا جیا یەکیان گرتووەو بە چەشنێکی تایبەتی لەگەڵ یەکتردا تێکراوونو پێکهێنراون .. دەبێ ئەوەش بزانین کە هەر کام لە ( هەواو ئاو و تیشكو گەرما ) چەند شتێکی ساکارن ، وە هیچیان خاوەن هەستو عەقڵو شعوور نینو ، وەك لافاو لە هەموو شتێکدا دێنو دەڕۆن ..

جا یەكگرتنو پێکهاتنی ئەو گوڵە لە ژمارە بەدەرانە [ لە ڕوانگەی سرووشتەوە ] بەو وێنەو شکڵو شێوەو جۆرێتی‌یە جوانو دڵگیرانەو بەو بەڕی ڕێكو پێکیو ووردەکاری‌یەوە ، بە ئاشکراو پێویستیو بەداهەت ئەوە پێویست دەکات کە ئەوەندە کارگەو چاپخانەی بچووك لەو مشتە خۆڵەدا بێن کە زۆر لە ژمارەی کارگەو چاپخانەکانی ئەورووپا زیاتر بن ، بۆ ئەوەی سرووشت چنینی ئەو کاڵا زیندووانەی لە تواناڈا بێو بەو تانو پۆیەی کە لە بەرچاودایە ئەو نەخشو نیگارە جوانانە برازێنێتەوە !!

ئای چەندە ئەو باوەڕە ئیلحادی‌یەی کە سرووشت پەرستان هەڵیان گرتووە ، لە ڕێگای زیریو عەقڵی کاملی مرۆڤەوە دوورە !

دەسا تۆیش بە باشی ئەمە بزانەو لەگەڵ بیروڕای ئەو کەسانەدا بەراووردی بکە کە لافی زیریو زانست لێ دەدەنو کەچی سرووشتیش بە بەدیهێنەر دەزانن ، با بۆت دەربکەوێ کە چەندە لە هەموو ئەبرازوویەکی عەقڵو زیری‌یەوە دوورن !

سەیرێکی ئەو بێ‌عەقڵو مەستانە بکە ، کە لەسەر شکڵو

شێوەی ئادەمیزادن ، سەیریکیان بکەو بزانە چۆن ئەو شتانەی کە بە لای ( ئیمکانو ) و عەقڵەوە بە لاوازترین جۆری خوارفەت دەژمێردێ کەچی ئەمان کردوویانە بە ڕێڕەو و ڕێباز بۆ خۆیان . سەرنجێکی ئەو چەشنە بیرکردنەوە ئەزۆکو نەگونجاوانەیان بدە ، با بزانی کە چەندە سووکو نزمن‌و شایستەی گاڵتە پێ کردنن !

ئەگەر پرسیار بکەیت‌و بڵێیت :

ئەگەر بێت‌و بەدیهێنانی بوونەوەران بدرێتە پاڵ سرووشت ئەوا چەندین گیرو گرفت‌و مەحاڵی زۆرمان دێتە ڕێگا .. ئەی ئایا کاتێ کە بەدیهێنان بە گشتی دەدرێتە پاڵ خواوەندی تاک‌و تەنهاو بێ شەریك چۆن ئەو هەموو گیروگرفتانە حەل دەبن‌و نامێنن ؟ وە تا ڕادەی پێویست ، بەدیهێنان شتێکی ئاسان دەبێت ؟

وەڵام :

هەروەك لە مەحاڵی یەکەمدا بۆمان ڕوون بووەوە ، درەوشاندنەوەی تیشکی خۆر بەو پەڕی ئاسانی‌و بە بێ هیچ گیروگرفتێك خۆی لە هەموو ماددەیەکدا دەردخست ، هەر لە بچووکترین شتی بێ گیانەوە تا دەگاتە فراوانترین تەختایی‌ی وەك زەریاو ئۆقیانووسەکان . ئەوەتا بە چاوی خۆمان دەبینین کە ئەم خۆرە ڕووناکی‌و شوێنەواری خۆی لەو شتانەدا بەو پەڕی ئاسانی دەردەخات ، وەك بڵێی هەر یەکەیان خۆرێکی میسالی بن ..

جا ئەگەر بێت‌و ئەو پەیوەندی‌و نیسبەتەی کە لە نێوان خۆرو ئەوانەدا هەیە بپچڕێنرێت دەبێ باوەڕ بەوە بکرێ کە هەر یەکە لەو ئەتۆمانە خۆرێکی سرووشتی‌ی هەیەو هەر کام لەو خۆرانەش دارای

بوونێـکی خۆیی خاریجی‌یە ٠ دیارە ئەمەش شتێکە کـە هیچ عەقڵێك وەری ناگرێ‌و تا بڵێی مەحاڵ‌و نەگونجاوە ٠

هەروەك ئەمـە لەم نموونەیەدا وایە ، بەو چەشنەیش ئەگـــەر بێت‌و بەدیهێنان‌و دروستکردنی هـەموو شتێك یەکســەر بدرێتـە پاڵ خواوەندی تاك‌و تەنهـاو صەمـەدو بێ شـەریك ، ئەوا تا ڕادەو پلەی ( وجوب ) بەدیهێنان ئاسان دەبێت ٠ چونکە ئەو کاتە هەر بوونەوەرێك هەر پێویستی‌یەکی بێت ، دەتوانرێ بەو پەڕی ئاسانی پێ‌ی بگەیەنرێ ، ئەویش لـە ڕێـگای (نیسبەت بوون‌و ، دەرەوشاندنەوە)وە ٠ ٠ کـەچی ئەگـەر بێت‌و ئەو نیسبەت‌و پەیوەندی‌یە بپچڕێنرێ‌و ئەو گوێڕایەڵی‌و بەکار هێنان‌و فەرمـان پێ سپاردنە نەمێنێ‌و ، لـە جێـگایاندا ملێچی کردن‌و خۆ دزینەوە لە فەرمانەکان دابنرێ‌و ، هـەموو شتێـکی خاوەن بوونیش کـە لەم بوونەوەرەدا هـەیە بە سەربەستی‌و بەرەڵایی وازی لێ بهێنرێ ٠٠ یان ئـەم کـارە بە ( سرووشت ) بسپێـررێ ، ئـەوا بـە ســەدان هـەزار گیروگرفت ، کـە دەگـەنە ڕادەو پلەی نەگونجـــان ( الأمتناع ) ، پەیدا دەبن ، بە ڕادەیەك کە تەنها بۆ دروستکردنی مێشێکی بچووك پێویست دەکات کە سرووشتی کوت‌وکوێر خاوەنی دەسەڵاتێکی ئەوتۆ بێت کـە بتوانێ هەموو بوونەوەر (الکون)ی پێ دروست بکات ، وە دارای حیکمەتێکی ئەوتۆ بێت کە بتوانێ ئەم بوونەوەرە گەورەیەی پێ بەڕێوە ببات ٠ چونـکە هەرچەندە مێش لە قەبارەدا بچووکە ، بەلام زۆر بـــە جـوانی‌و ڕێك‌وپێـکی خولقێنراوەو ، زۆربەی ( مــاددە ) پێکهێنەرەکانی بوونەوەرانی تێدایە ، وەك بڵێی پێرستێکی پوختە کراوی ئەو بوونەوەرانەیە ٠٠ جا ئەمەش تەنها مەحاڵێك نیەو ئیتر کۆتایی‌ی پێ بێت بەڵـکوو هەزار مەحاڵی تێدایە !

بە کورتی :

هەروەك بوونی هاوتاو هاوبەش لە (خوایەتی) خوادا شتێکی مەحاڵو نەگونجاوە ، هەروەها دەستخستنە ناو کاروبارەکانی (پەروەردگاریتی)ی خواو خۆ هەڵقورتاندن لە کاروباری بەدیهێنانی ئەو شتانەی کە ئەو بەدیان دەهێنێ ، ئەویش بەهەمان جۆر مەحاڵو نەگونجاوە •

ئەو گیروگرفتانەش کە لە مەحاڵی دووەمەدا باسکرانو لە بەشێکی زۆری پەیامەکانیشدا چەسپاندوومانن ، ئەوا لەوەدان کە وتمان : « هەر کات بەدیهێنانی هەموو شتێك بدرێتە پاڵ خوای تاكو تەنها ؛ ئەوا وەك دروستکردنی تاکە شتێك ئاسان دەبێت » بەڵام ئەگەر بدرێتە پاڵ سرووشتو هۆکان ؛ ئەوا بەدیهێنانی یەك شت بە قەدەر دروست کردنی هەمووان پڕ لە کێشەو گیروگرفت دەبێت » ••

جا لەبەر ئەوەی ئەم گیروگرفتانەمان بە چەندین بەڵگەی پتەوی چەسپێنەر لە چەندین پەیامدا چەسپاندووە ، ئەوا لێرەدا کورتەی یەکێك لەو بەڵگانە باس دەکەین :

ئەگەر هاتو یەکێك ـ چ لە ڕێگای سەربازی وە چ لە ڕێگای فەرمانبەرییەوە ـ پەیوەندیی لەگەڵ پادشایەکدا بەستو پاڵی بە دەستەڵاتی پادشاوە دایەوە ، دەتوانێ ئەوەندە کرداری ئەوتۆ بەجێ بهێنێ کە سەد هەزار جار ئەوەندەی ئەو کردارانە بێت کە بە تەنها خۆی دەتوانێ بیانکات • ئەمەیش بە هۆی پاڵدانەوەیەوە بە هێزی ئەو پەیوەندیو نیسبەتەی کە لەگەڵ پادشادا هەیەتی •

[ بۆ ئەوەی زیاتر لەمە تێ بگەین دەڵێین ] :

ئەم سەربازە هەر چەندە یەك كەسی تاكو تەنهایە ، كەچی دەتوانێ بە ناوی پادشاوە هەندێ جار شایەك دیل بكات ، چونكە هەموو ئەو ئامێرو كەرەسەو تەقەمەنییانەی بۆ ئەم جۆرە كارانە پێویستی پێیان دەبێت ؟ ئەم خۆی هەڵیان ناگرێتو ناچاریش نیە كە هەڵیان بگرێت ، بەڵكوو گەنجینەی پادشا ئەم شتانەی بۆ دابین دەكاتو ، كەرتەكانی سوپاكەیشی بۆی دەهێنن و هەڵی دەگرن . هەموو ئەمانەش بە هۆی ئەو پەیوەندیو پاڵدانەوەو نیسبەت پەیداكردنەی كە لەگەڵ پادشادا هەیەتی .. ئەوەتا چەند كردارێكی لەسەر دەست ڕوو دەدات كە وەك كرداری پادشایەكی گەورە وان ، وە چەند شوێنەوارێك دەردەخات كە لە هی سوپایەكی گەورە دەچن .

كەواتە ئەم سەربازەی سەر بە پادشا وەك ئەو مێروولەیە وایە كە بە هۆی ئەو سەربازیو فەرمانبەرییەوە دەتوانێ كۆشكی فیرعەونێكی ستەمكار بڕووخێنێ .. هەروەها وەك ئەو مێشوولەیە وایە كە بە هۆی ئەو نیسبەتو پەیوەندییەوە دەتوانێ نەمروودێكی كەللەڕەقی سەركەش بتۆپێنێ .. هەروەها ئەم سەربازە وەك (تۆو)ی درەختی (سنەوبەر)ی لێ دێت ، ئەو تۆوە بچووكەی كە وەك دەنكە گەنمێك وایەو ، بە هۆی ئەو پەیوەندیو نیسبەتەوە هەموو ئامێرەكانی ئەو درەختە زەبەلاحەی سنەوبەر پەیدا دەكاتو پێكهاتووەكانی گەشە پێ دەستێنێ(١) .

---

(١) بەڵێ ، ئەگەر پەیوەندیو نیسبەت لە نێواندا بوو ، ئەوا ئەو تۆوە فەرمان لە قەدەری خوا وەردەگرێتو شەرەفی هەڵسانی بەو كردارە دەدرێتێ .. بەلام ئەگەر ئەو پەیوەندیو نیسبەتە بپچرێت ، ئەوا تەنها دروستكردنی ئەو تۆوە داخوازی توانستو مەهارەتو چەند ئامێرێكی ئەوتۆ دەبێت كە زۆر زۆر لە پێویستییەكانی دروستكردنی درەختی زەبەلاحی سنەوبەر زیاتر بن . چونكە =

جا ئەگەر ئەو پەیوەندی‌و نیسبەتەی نێوانیان بپچڕێت‌و ئەو فەرمانبەری‌یەی لێ بسێنرێتەوە ، ئەوا دەبێ هەموو ئەو کردارانەی کە ئەنجامیان دێنێ بیانگرێتە ئەستۆی خۆی‌و لەسەر شان‌و دەست‌و بازووی خۆی پێویستی‌یەکانی هەڵبگرێ‌و بە کەرەسەو ئامێرەکانیش سەرشانی خۆی ماندوو بکات . دیارە ئەو کاتەش تەنها بە گوێرەی ئەو هێزەی کە لە دەست‌و بازووی لاوازیدایە دەتوانێ هەڵبسێ بەو کردارانەو ، تەنهـا ئەوەندەی لە توانادا دەبێ کە لەگەڵ ئەندازەی ئەو کەرەسانەی هەڵی گرتوون بگونجێ ، بە جۆرێك کە ئەگەر داوای ئەنجام هێنانی ئەو کردارانەی لێ بکرێ کە لە حاڵەتی یەکەمدا بەو بەڕی ئاسانی‌یەوە ئەنجامی دەهێنان ، ئەوا کۆڵەواری‌و نەتوانینی خۆی بە ئاشکرا دەردەبڕێ .. مەگەر [ کە ئەمەش بە ئاشکرا شتێکی مەحاڵە ] بتوانێ هێزی سوپایەکی تەواو لە دەست‌و بازووی خۆیدا کۆ بکاتەوەو هەرچی کارگەو کەرەسەو ئامێرەکانی سوپایش هەن ، ئەو بە تەنهـا خۆی بە کۆڵ هەڵیان بگرێ !!

جا توخوا ئایا ئەو کەسانەش کە خەریکی هۆنینەوەو گێڕانەوەی

---

=

دەبێ هەموو ئەندامەکانی ئەو درەختە سنەوبەرە ـ کە یەکێکە لە شوێنەوارە دیارو ئاشکراکانی قودرەتی خواوەندو لە ناو چیاو شاخەکاندان‌و ئەوەندەی تر جوانیان بەو چیاو شاخانە بەخشیوە ـ دەبێ ئەندامەکانی ئەم درەختە لەناو دوو توێی ئەو تۆوەدا بین ، کە لە ڕاستیدا ئەویش درەختێکی مەعنەوی‌یەو یەکێکە لە شوێنەوارەکانی قەدەری خواوەند ، چونکە کارگەی ئەو درەختە لەناو ئەو تۆوەدایە .. جا ئەو درەختەی کە قەدەری خوا لەو تۆوەدا دروستی کردووە ، لە پاشاندا بە توانستی ئەو خوایە شکڵ‌و شێوەی درەختێکی سنەوبەری تەندار وەردەگرێ .
( س . نووری )

چیرۆکە خورافیو بێ نرخو لاوازەکانن ، شەرم لـە نزیك بوونەوەی ئەم جەشنە خەیاڵە ئابڕووبەرانە ناکەن ؟ چ جای ئەوانەی کە لافی عەقڵو زیری لێ دەدەن ؟!

لەمەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە :

تەسلیم کردنو گێڕانەوەی هـەموو کاروبارێـکی بوونەوەران بۆ خوای ( واجب الوجود ) تا پلەی پێویست ( الوجوب ) ئاسـانە • بەڵام گێڕانەوەی بەدیهێنانیان بۆ ( سرووشت ) ئـەوا تا پلەی نەگونجـان ( الاستحالة والامتناع ) مەحـاڵو پڕ لـە گیروگرفتەو ، لـە دەرەوەی بازنەی زیریدایە •

**مەحالی سێهەم :**

ئەم مەحاڵە لە هەندێ پەیامدا بە دوو نموونە ڕوونکراوەتەوە :

نموونەی یەکەم :

جـارێك مرۆڤێـکی زۆر نەزان کـە لەوەوپێش هیچ لایەنێـکی شارستانێتیی نەدیبوو ، لـــە دەشتێـکی چۆڵدا دەچێتـە ناو کۆشکێـکی جوانەوە کـە بەو پەڕی جوانـکاری ڕازابووەوەو تازەترین ئامێرو هۆو پێداویستیی تیا ئامادە کرابوو ••

کـە دەچێتە ناویەوە ، بە ووردی سـەرنجی دەداتو سـەیری نەخشو نیـگارو ووردەکاریو جوانـکاریی ئەو کۆشکە دەکـات ••

بەڵام نەزانیو بێ عەقڵیە لـە ڕادە بەدەرەکەی وای پێ کرد کـە بڵێ : « یەکێك لـەم شتە جوانانەی ئەم کۆشکە ، کۆشکەکەی دروست کردووە ، چونـکە لەم بیابانو دەوروبەرەدا هیچ کەسێك دیار نیە کـە

ئەوە بسکەیەنێت ئەو دەستی بۆ بنیادنانو ڕازاندنەوەی ئەم کۆشکە درێژ کردبێت ٠ ٠

ئیتر بۆ دۆزینەوەی بنیادنەری ئەم کۆشکە دەستی کرد بە گەڕانو پشکنین لە نێوان ئەو شتانەی کە لە ناو کۆشکەکەدا بوون ، وە چاوی بە ناویاندا دەگێڕا تا شتێك بدۆزێتەوە دروست کردنو ڕازاندنەوەو داین کردنی ئەو کەرەسانەی لە تواناادا بێت ٠ بەڵام هەر چەندەش دنیا نەدیدە بوو کەچی هەر چێکی دەبینی نەدەچووە عەقلی‌یەوە کە ئەو شتە بەدیهێنەری کۆشکەکە بێت ٠٠ پاش ماوەیەك لە گەڕانو پشکنین ، دەفتەرێکی دۆزی‌یەوە کە نەخشەی بنیادنانو پێرستی ناوەڕۆكو یاساکانی بەڕێوەبردنی ئەو کۆشکەی تیا نووسرابووەوە ٠٠

هەر چەندەش ئەو دەفتەرە ـ لە ڕاستیدا ـ وەك هەموو ئەو شتانەی کە تیایدا نووسراوە ، بنیادنانو ڕازاندنەوەی ئەو کۆشکەی لەبارەدا نیە ، چونکە نە دەستی هەیە تا کاری پێ بکاتو نە چاویشی هەیە تا پێی ببینێت ، هەر چەندەش ئەمە حاڵی ئەو دەفتەرەیە ؟ کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئەم کابرایە دڵی چووە سەر ئەو دەفتەرەو لای وابوو کە لە هەموو شتەکانی ناو کۆشکدا زیاتر بۆ ئەو مەبەستە دەگونجێ ، چونکە نەخشەی بیناو کەرەسەو ناوەڕۆکی کۆشکەکەی تێدایەو ، زیاتر لەگەڵیا گونجاوە ( چونکە ئەو دەفتەرە ـ وەك لە پاشاندا بۆمان دەردەکەوێت ـ ناونیشانی یاسا زانستی‌یەکانی خواوەندە ) ٠ لەبەر ئەوە ناچار بوو بڵێ :

ـ ، تەنها ئەم دەفتەرەیە کە ئەم کۆشکەی بنیات ناوەو ڕێكو پێکی کردووەو ڕازاندوویەتەوەو ، شتەکانی ناویشی ڕێكو پێك کردووە ، ٠

ئیتر بەم جۆرە وتەو وڕێنە بێ نرخانە ، ئەو پەڕی نەفامیو بێ عەقلیی خۆی دەربڕی •

لە ڕووناکی ئەم نموونەیەوە دەڵێین :

کابرایەکی وەحشیو نەفام لەوانەی کە ڕێڕەوی سەرکەشیو سەرپێچی کردنیان گرتووەتە بەرو بیروباوەڕی (سرووشت پەرستی)یان هەڵگرتووە ، دەچێتە ناو ئەم کۆشکە گەورەیەی کەونەوە ، کە بێ گومان لەو کۆشکەی نموونەکەی پێشەوە ڕێكو پێکترو جوانترو پڕ لە وردەکاری ترە بە چەشنێك کە هەرگیز جێگای بەراوورد کردن لە نێوانیاندا نیە ، چونکە هەر لایەنێك لە لایەنەکانی کۆشکی گەورەی کەون بگریت ، چەندین موعجیزەی بێ هاوتاو چەندین حیکمەتی بەرزیان لێ دەدرەوشێتەوە ••

ئەم کابرایە دەچێتە ناو کۆشکی ئەم کەونەوەو پشت لە هەموو شوێنەوارە زۆرەکانی سنعەتی کردگار هەڵدەکات کە لە بەردەمیدایە ، ئەو کردگارەی کە هەموو بەدیهێنراو و گونجاوەکان ( الممكنات ) هەرگیز ناگەن بە پلەی ئەو ، وە ئەو بەرزە بەسەر هەموویاندا • • ئیتر ئەم مرۆڤە دێتو بە دوای هۆی بەدیهێنەری ئەم گونجاو و بەدیهێنراوانەدا دەگەڕێو دەست بە وورد بوونەوەو پشکنین دەکاتو لە گەڕانەکەیدا چاوی بە کۆمەڵی یاسا خواییەکانو پێڕستی سنعەتی کردگار دەکەوێ ، کە بە هەڵە ـ وە هەڵەیەکی زۆر گەورەیش ـ ناوی «سرووشت»ی لێ نراوە •• ئەم سرووشتەیش وەك دەفتەری ئاڵو گۆڕی یاساکانی کاروبارەکانی توانستی خوا وایە ، هەروەها وەك ئەو تابلۆیەی قەدەری خوا وایە کە شتی تیا دەنووسرێو شتی تیا دەکوژێنرێتەوە ( لوحة المحو والاثبات ) ، واتە لە بازنەی بەدیهێنراو و

دروستکراوەکاندا ئـەوەی پـێوی بێ دەینووسێ‌و دەیهێڵێتەوە ، ئەوەیش پـێوی لای بێت ، لای دەبات‌و دەیکوژێنێتەوە ..

جا ئەم نەفامەش کە لەتوان بەدیهێنراوەکانی بەرچاویدا بە دوای ەدیهێنەریان دەگەڕێت ، دەڵێت :

« مـادەم دەبێ هۆیەك ببێ ئـەم شتانەی بـەدی هێنابێ ، وە هیچ شتێکیش وەك ئەم دەفتەرە لـە ئارادا نیـە کە بەو چەشـنە پەیوەندی‌ی بەو شتانەی ناو کۆشکی کەونەوە ببێ ، وە مادەم باوەڕیشم بـە خـوای بەدیهێنەر نیـە ، کەواتە دەبێ ئەم دەفتەرە ئەو شتانەی بەدی هێنابێ » !! هـەر چەندەش عەقڵ ئەوە ڕەفز دەکات کە ئەم دەفتەرە کـەڕو کوێرو کۆڵەوارە هـەڵسابێ بـەو کردارانـەی کـە تایبەتـکاری‌ی بەروەردگاریتی‌یەکی ڕەهان ، کـە ئەویش داخوازی دەسـەڵاتێـکی ڕەهاو فراوانە .

ئێمەیش پێی دەڵێین :

ـ ئەی تێنەگەشتووی سەرسوڕماو ! ئـەی ئەو گێلەی کـە لـە گێلترین گێل زیاتر خۆی گێل کردووە !

سەر لە زەلـکاوی ( سرووشت ) دەربێنەو سـەیری دەوروبەری خۆت بـکە . ئەوەتا هەموو بوونەوەرو بەدیهێنراوان ، هەر لە ئەتۆمەوە تا دەگانە کاکێشان ، شایەتی لەسـەر بەدیهێنەری گەورەی بەدەستەڵات دەدەن‌و بەڵـگەی تاك‌و تەنهایی‌ی ئەوون .. سەرت هەڵبڕەو خواوەندی بەدیهێنـەر ببینە ، دەبینی کـە هـەریەك لـەو بوونەوەرانە بە زمـانی تایبەتی‌و بەڵـگەی تایبەتی‌ی خۆیان شایەتی لەسـەر ئەو خوایە دەدەن . سەیر بـکە ، با درەوشاندنەوەی ئەو خوایە لە جیهاندا ببینیت کـە ئەم

کۆشکەی بنیاد ناوەو پێرستو بەرنامەو یاساکانی لەو دەفتەرەدا نووسیوەتەوە .. سەرنج لە فەرمانە بەرزەکانی ئەو بدەو گوێ لە قورئانە پیرۆزەکەی ڕابگرەو ، خۆت لە لیتەو قوڕاوی ئەم ووڕێنەو ووتە بێ نرخانە ڕزگار بکە !

نموونەی دووهەم :

جارێك مرۆڤێك کە لەوپەڕی نەزانیداو دنیا نەدیدە بوو ، دەچێتە ناو سوپایەکی ساماناکەوە .. وە لە بەردەم ئەو ڕاهێنانە گشتی‌یەی کە سەربازەکانی سوپا پێکەوە دەیانکرد ، دەحەپەسێ ، کە دەبینێ ئەو پەڕی ڕێكو پێکی‌و گوێڕایەڵی پیشان دەدەن . پاشان سەرنج لە جمو جوولە ڕێکخراوەکانیان دەدات کە دەبینێ هەموو سوپاکە چ تیپو چ لیواو چ فیرقە هەموو بە بزووتنەوەی یەك دانە کەس دەبزووێنەوەو ، بە بێ دەنگ بوونیشی بێ دەنگ دەبن ، وە هەر کاتیش ئەم یەك کەسە فەرمانی تەقەکردنی بۆ دەرکردن ئەوا هەموویان یەکسەر دەست بە تەقەو دەست ڕێژ کردن دەکەن ..

بەڵێ ئەم مرۆڤە سەرنجی لە هەموو ئەمانە دا . بەڵام تێنەگەیشتن‌و کەودەنی‌یەکەی وایان لێ کرد کە هیچ شتێك لە بارەی فەرمانەکانی پێشەوایەتی‌ی سوپا تێنەگات کە لە یاساکانی پادشایەتیدا دیاری کراون . هەر لەبەر ئەم تێنەگەیشتنەیش ئیکاری‌ی سەرکردایەتی‌ی سەرکردەی کردو بە خەیاڵ وای دەزانی ئەم سەربازانە بە چەند پەتێکی ماددی بە یەکەوە بەسراونەتەوە ! وەك بڵێی هیچ شتێك بە بێ هۆی ماددی بەڕێوە نەڕوات ..

پاشان بیری لەو پەتە خەیاڵی‌یە دەکردەوە کە ئایا دەبێ چەندە

سەیرو سەرسوڕهێنەر بێت ؟ بەڵام لە ڕاستیدا خۆی کەوتونە سەرسوڕمانەوە ، وە هەر بەو سەرسامیو سەرسوڕمانەیشەوە سەربازگەی بەجێ هێشتو کەوتە ڕێ ..

هەر ئەم مرۆڤە ، لە ڕۆژی جومعەدا ڕێی دەکەوێتە مزگەوتێکی گەورەی وەك ( مزگەوتی ئەیا صۆفیا ) . . سەیر دەکات هەڵسانو دانیشتنو ڕکووعو سوژدەی جەماعەتی موسڵمانان لەسەر دەنگی یەکێکیان ڕوو دەدات . جا لەبەر ئەوەی ئەم مرۆڤە لە مانای « شەریعەتەکانی خواوەند » ـ کە یاسا مەعنەوییو ئاسمانییەکانە ـ تێنەدەگەیشت ، وە هەستی بەو دەستوورو یاسا مەعنەوییانە نەدەکرد کە لە فەرمانەکانی خاوەنی شەریعەتدان ، لەبەر تێنەگەیشتنو هەست نەکردنی بەمانە ، لای وابوو کەئەو جەماعەتە بە چەند پەتێکی ماددی بە یەکەوە بەسراونەتەوە ، گوایە ئەو پەتە سەیرانە ئەو کۆمەڵەی بە یەکەوە بەستووەتەوەو هەموو جمو جووڵو وەستانێکیشیان بە بۆنەی ئەو پەتانەوەیە ! بەم جۆرە ڕۆشتو کەوتە ڕێو ئەم جەشنە بیرکردنەوە کەم نرخەشی لەگەڵ خۆدا هەڵگرت ، کە ئەوەندە بێ بایەخو کەم نرخە کە ئەو جروجانەوەرە دڕندانەش لە شکڵی مرۆڤدان ، گاڵتەی پێ دەکەن ..

جا لە ڕوانگەی ئەم نموونانەوە دەڵێین :

مولحدێك لەوانەی کە چەمکی پڕ لە نەفامیو سەرکەشی سرووشتەیان لەگەڵ خۆ هەڵگرتووە ، دێتە ناو ئەم جیهانەی کە سەربازگەیەکی ساماڵو جوانی سوپای پادشای گەورەیەو ، مزگەوتێکی گەورەو ڕێكو پێکی ئەوتۆیە کە تەقدیسی پەرستراوی ئەزەلی خۆی دەکات .. کە دێتو سەیری ئەو ڕژێمە ڕێكو پێکەی

بوونەوەر ( الكون ) دەكات ، لای وا دەبێ کە چەند یاسایەکی ماددیو چەند ماددەیەکی ڕەقو تەقن • وە بە خەیاڵی خۆی وا دەزانی کە فەرمانەکانی یاساکانی پەروەردگاریتیی گشتی ( الربوبیة المهیئة ) ـ کە چەند یاسایەکی ئیعتبارین ـ هەروەها دەستوورەکانی شەریعەتی پەرستراوی ئەزەلی ـ کە چەند دەستوورێکی مەعنەوینو تەنها لە زانستی خوادا هەنو بوونیان هەیە ـ ئەم بە خەیاڵی خۆی لای وا دەبێ کە هەر کام لەو یاساو دەستوورانە وجوودی خاریجییان هەیەو چەند یاسایەکی ماددین • ئیتر دێتو ئەو یاسایانەی کە لە « عیلم » و « کەلام »ی خواوەندەوە دەرچوونو تەنها وجوودی عیلمییان هەیە [ واتە : تەنها لە زانستی خوادا هەن ] ، ئەم دێتو لەبری توانستی خوا دایەنێو کاروباری بەدیهێنانو دروستکردنیان دەداتێو پاشان ناوی «سرووشت»یان بەسەردا دەبڕێ ، ئنجا ئەو هێزە هاتووچۆکەرەی ناو ئەو یاسایانەش ( القوة الساریة ) ، کە بریتییە لە یەکێك لە درەوشاندنەوەکانی توانستی پەروەردگار ، ئەم مولحیدە بە هێزێکی کاریگەری دادەنێو وەك خاوەن توانستێکی سەربەخۆ پێشوازیی لێ دەکات !

جا توخوا پێم ناڵێی ئایا کەودەنیو نەفامیی لەمە زیاتر ڕووی داوە ؟ ئایا ئەم نەفامییە بە چەندین جاریش لە نەفامیی کابرای ناو نموونەکە زیاتر نیە ؟

**بە کورتی :**

**ئەو شتە وەهمییەی کە سرووشت پەرستان ناوی «سرووشت»ی لێ دەنێنو هیچ حەقیقەتێکیشی نییە ؛ ئەگەر بێتو وا دابنرێ کە بوونی ڕاستەقینەی خاریجیشی بێ ، ئەوا تەنها سەنعەتێکە نەك**

**سنعەتـكار ٠٠ وە نەخشێكە نەك نەخشەكێش ٠٠ وە چـەند حوكمێكە نەك حـاكم ٠٠ وە شەریعەتێـكی فیطری‌یە نەك شەریعەت‌دانەر ٠٠ وە پەردەیەكی رووكەشی بەدیهێنراوە كە بەسەر رووی عیززەتی خوایەتی‌ی خوادا دادراوەتەوە ، نـەك بەدیهێنەر ٠٠ وە فیطرەتو بەدیهێنراوێـكی كارتێكراوە ، نەك بەدیهێنەرو كردگار ٠٠ وە یاسایەكە نەك توانـستو خاوەن توانست ٠٠ وە ئامێرێـكی پێوانەیە تا قیاسی شتانی پێ بكرێ ، نەك سەرچاوەی شتان ٠**



پوختەی ئەم قسانە [ كە لە ڕوونكردنەوەی مەحاڵەكانی ئـەم سێ ڕێـگایەدا باسكران ] ، ئەوەیە كە :

مادەم بوونەوەران [ لەڕاستیدا ] هـەن ، وە مادەم عەقڵیش نـــە بۆچوونی خۆیدا بۆ دۆزینەوەی بەدیهێنەری ئەم بوونەوەرانە لـە چوار ڕێـگا زیاتری لەبەردەمـدا نیـە ـ هـەروەك لە پێشەكی‌ی ( خاطیرەی ) شازدەهەمدا باسكراوە ـ وە بە تەواوی‌و یەكجاریش نەگونجان‌و بەتاڵی‌ی سیان لەو چوارڕێـگایەمان بۆ چەسپا بە باسكردنی سێ‌دانە مەحاڵی ڕوون‌و ئاشكرا بۆ هەر كام لەو سێ ڕێـگایە ٠٠

**كـەواتە بە ئاشكرایی‌و بەداهـەت‌و پێویـست ڕێـگای چـوارەم دەچەسپێ ، كە بریتی‌یە لە ڕێـگای بوونی بەدیهێنەری تاكی تەنهـــا ٠ چەسپاندنی ئەو ڕێگایەش لە یەقینێكی ئەوتۆوەیە كە هیچ گومان‌و دوو دڵی‌یەكی تێـدا نییە ٠ ئەو ڕێـگایە ڕێـگایەكە كـە ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕووناكی دەكاتەوە كە دەفەرموێ :**

**« أفي الله شك فاطر السموات والأرض » ؟**

ئەم ئایەتە بە ڕوونی‌و بەداهەت بەڵـگەیە لەسەر بوون‌و خوایەتی‌ی

خواوەندی « واجب الوجود » و ، لەسەر ئەوەی کە خوایەتیی ئەم خوایە هەموو شتێکی گرتۆتەوەو ، هەرچی شت هەیە لە دەستی توانینی ئەوەوە پەیدا بوون و ، هەموو کاروبارێکی ئاسمانەکان و زەویش لە ژێر دەستی توانای ئەودان •

**جا ئەی کاکی هۆ پەرست !**

**ئەی ئەو کەسەی تا رادەی پەرستن شەیدای «سرووشت» بووە !**

**باش بزانە کە ( سرووشتی ) هەر ( شتێك ) وەك خودی ئەو شتە بەدیهێنراو و دروستکراوە** ، چونکە بە تازەیی و بە جۆرێکی پڕ لە وردەکارییەوە پێك دێت • هەروەها هۆ ئاشکراکەیشی وەك هەر هۆیەکی تر ، ئەویش دروست کراو و بەدیهێنراوە ••

جا مادەم بوونی هەر شتێك پێویستی بە چەند هۆو پێداویست و ئامێرێکی زۆر هەیە ، ئەوا دەبێ یەکێکی خاوەن توانستی رەها بێ کە ئەو سرووشت و هۆیە بەدی بهێنێ و دروستیان بکات •• وە دەبێ ئەو خاوەن توانستە رەهایە لە توانستی خۆیدا ئەوەندە دەوڵەمەند بێت کە پێویستی بە هیچ شتێك نەبێ و ، هەرگیز هۆ بێ دەسەڵات و کۆڵەوارەکان لە کاروباری پەروەردگاریتیی خۆی و بەدیهێنانی شتاندا ، بەشدار نەکات • خۆ جگە لە خوای گەورە هیچ کەسێکی تر نییە کە بەم جەشنە خاوەنی توانستێکی ئاوا دەوڵەمەندو گەورەو بەرز بێت • هەر ئەو خوایەیە کە چ هۆکان و چ ئەو شتانەی لە رێگای ئەو هۆیانەوە پەیدا دەبن ، یەکسەر دروست دەکات و ، هۆکارییەکی ئاشکراو رواڵەتیان لە نێواندا پەیدا دەکات و ، بە رێك و پێك کردنیان پەیوەندییان لە نێواندا دادەنێ و ، سرووشت و هۆکانیش دەکاتە پەردە

لەبەردەم دەستی قودرەت‌و لەبەردەم گەورەیی‌ی خۆیداو ، بەمەش درەوشاندنەوەی ناوە جوانەکانی خۆی‌و نووری حیکمەتە ڕەهاکەی خۆیمان پیشان دەدات • وە بۆ ئەوەی کە عیزەت‌و گەورەیی‌ی خۆی تەقدیس بکات‌و پاکی ڕابگرێ ؟ ئەوا ئەو هۆیانەی کردۆتە سەرچاوەی ئەو کاروبارانەی کە بە چاوی ڕواڵەت‌بینی‌یەوە بە ناتەواوی‌و ستەم لە شتاندا دەردەکەوون ، تا هیچ نەقسێك ڕوو نەکاتە ئەو عیزەتەی کە بۆ پەروەردگاریتی‌ی خۆی بڕیاری داوە •



ئێستاش داوای ئەوەت لێ دەکەین کە عەقڵە سەرگەردانەکەت بکەیت بە حەکەم‌و ، ئەم پرسیارەت ئاراستە دەکەین :

ئایا کام لەم دووانە تێگەیشتنیان ئاسانترە ؟ :

ئایا سەعاتچی‌یەك هەڵبسێ بە دروستکردنی ئامێرو کەرەسەکانی سەعات ، وە بە گوێرەی ڕێك‌و پێکی‌و لەگەڵ یەك گونجانیان یەکیان بخات • یان لەو ئامێرانەدا مەکینەیەکی لە عادەت بەدەر بنێ‌و ئەم دروست کردنە بە دەستە ڕەق‌و تەق‌و بێ گیانەکانی ئەو ئامێرانە بسپێرێ ؟!

پێم بڵێ : ئایا ئەم بیروڕایە شتێکی مەحاڵ‌و نەگونجاو نیە ؟

یان کام لەم دووانە دەچێتە عەقڵەوە ؟ :

نووسەرێك پێداویستی‌یەکانی نووسین ( لە مەرەکەب‌و کاغەزو قەڵەم ) ئامادە بکات‌و خۆی بۆ خۆی کتێبێك بنووسێ •• یان ئەو نووسەرە بێت لە نێوان ئەو کاغەزو قەڵەم‌و مەرەکەبەدا چاپخانەیەکی تایبەتی بۆ ئەو کتێبە دابنێ ـ کە دیارە ئەم چاپخانەیەش زۆر لە کتێبەکە ئاڵۆزترە ـ پاشان نووسینی کتێبەکە بدات بەسەر چاپخانەکەداو

ئیتر خۆی هیچ دەستێك نەخاتە ناو کارەکەو بەو چاپخانەیە بلّێ « فەرموو تۆ کتێبەکە دابنێو بنووسە » ؟

کام لەم دووانە دەچێتە عەقڵەوە ؟

ئایا ئەگــەر ئەم کــارە بدرێتە دەست ئەو چاپخانەیە شتێکی پڕ لــە گیروگرفت نیە ؟ ئایا سەد ئەوەندەی نووسینی نووسەرەکە پڕ لە کێشە تر نیە ؟ ئایا هیچ خاوەن ژیرییەك ئەم کارە بە کارێکی ڕەوا دەزانێ ؟

خۆ ئەگەر بلّێیت :

بەلّێ ڕاستە دروستکردنی چاپخانەیەك بۆ چاپکردنی ئەو کتێبە لــە دانانی کتێبەکە تورسترو ئالۆزترە ، بەلاّم مەکینەی چاپ تا بلّێی ئاسانتر هەڵدەستێ بە نووسینی کتێبەکە ، چونــکە دەتوانێ چەندین نووسخــەی زۆری لێ دەربــکات ..

ئەوا لە وەلاّمدا دەلّێین :

خواوەندی نەخشەکێشی ئەزەلی بە قودرەتی ڕەهای خۆی وە بۆ مەبەستی تازە کردنەوەی دەرەوشاندنەوەکانی ناوە جوانە ڕەهاکانی خۆی لــە هەموو کاتێکدا ، خودی بەدیهێنراوەکانو ئەدگارو تایبەتکارییەکانیان بە چەند شکڵو شێوەیەکی جیا جیا دروست دەکات ، بە چەشنێك کــە هیچ بەدیهێنراوێك ـ کە نووسراوی خواوەندی صەمەدو پەروەردگارە ـ بە تەواوی لە هیچ بەدیهێنراوێکی تر ناچێت .

بەلّێ ، بۆ ئەوەی هەموو شتێــکی بەدیهێنراو مانا جیا جیاو مەبەستە جۆراو جۆرەکانی خۆی ڕابگەیەنێ ، دەبێ ڕوخسارو شکڵێــکی ئەوتۆی بێ کە لەوانی تر جیای بکاتەوە ..

بە ووردی سەیری سەروسیمای مرۆڤ بکە ، دەبینی چەند نیشانەیەکی جوداکەرەوە لەو دەمو چاوەدا دەبینی کە خاوەنەکەی لە هەموو مرۆڤو هەموو دەمو چاوێکی تر هەر لە سەردەمی حەزرەتی ئادەمەوە ــ درووی لەسەر بێت ــ تا ئێستاو تا دنیاش دنیایە ، جیا دەکاتەوە ، هەر چەندەش لە ئەندامەکانیاندا بە تەواوی لەیەکتر بچن ٠ ئەمەش ڕاستییەکی ئاشکرایەو کەس گومانی تێدا نیە ٠

کەواتە سەرو سیمای هەر دەمو چاوێك کتێبێکی سەربەخۆی ئەو دەمو چاوەیە ٠

جا بۆ ئەوەی ئەم کتێبە سەربەخۆیە بە ڕێك‌و پێکی‌و ووردەکاری دەربهێنرێ ، دەبێ کۆمەڵە پیتێکی تایبەتیی خۆی بێ‌و بە ڕێکخستنێکی تایبەتی ڕێك بخرێن ٠ بگرە داخوازی ئەوە دەبێ کە بە دانانێکی تایبەتی‌و جیاواز لەوانی تر دابنرێت ، وە ماددە تایبەتییەکانی خۆی لەو جێگا تایبەتییانەی تیایدا هەن بهێنرێن‌و لەگەڵ پێداویستییەکانی بوون‌و دەرهێنانی ئەو کتێبەدا ڕێك بخرێن ٠٠

هەموو ئەمانە پێویستی بە کارگەیەکی سەربەخۆی تایبەتی هەیە ، واتە هەموو شتێك‌و هەموو دەمو چاوێك پێویستیی بە چاپخانەیەکی تایبەتی هەیە !!

پاشان ئەگەر بێت‌و بە فەرزی مەحاڵ وا دابنێین کە «سرووشت» وەك چاپخانەیەك وایە ٠٠ ئایا ئەم چاپخانەیە پێویستی بەڕێکخستن‌و ڕیز کردنێکی تایبەتی نیە ؟ ئایا خودی چاپخانەکە ــ چ جای ڕیز کردن‌و ڕێکخستنی پیتەکان ــ پێویستی بە ڕێکخستن نیە ؟!

خۆ ئەو ماددانەی کە لە تەنی هەر زیندەوەرێکدا هەن ، بە بێ

هیچ گومانێك ، له مادده‌كانی چاپخانه‌و رێكخستنیان ئاڵۆزترن • چونكه كۆكردنه‌وه‌و ده‌رهێنانیان له هه‌موو سووچو نوژبێكی جیهانه‌وه‌و ، به‌دی هێنانیان بــه ته‌رازوویه‌كی تایبــه‌تیو ، رێكخستیان به رژێمێكی دیاری كراو ، پاشان سپاردنیان به چاپخانه •• هه‌موو ئه‌م كارانه پێویستی به به‌دیهێنه‌ری چاپخانه‌كه ده‌بێت كــه بیانــكات ، وه ئه‌م كارانه هه‌رگیز به بێ ویستی ئــه‌و ئه‌نجام نادرێت ، كــه ئه‌ویش بریتیه لــه توانستی به‌دیهێنه‌رانه‌ی خواوه‌ندی به‌دیهێنه‌ری به توانا •

كه‌واته ئیحتیمالی ئه‌وه‌ی كه «سرووشت» وه‌ك چاپخانه‌یه‌ك وابێت ، ئیحتیمالێكی بێ مانایه‌و له راستیدا خورافه‌تێكی ئاشكراو رووونه !

به‌م جه‌شنه ، وه له روانگه‌ی ئه‌م دوو نموونه‌یه‌وه [ واته سه‌عات‌و كتێبه‌كه ] ، بۆمان ده‌رده‌كه‌وێ كــه چ هۆكان ( الاسباب ) وه چ ئه‌ هۆ په‌یدابووه‌كان ( المسبَّبات ) ، هــه‌موو خواوه‌ندی به‌دیهێنه‌ری زولجه‌لال ـ كــه توانای به‌سه‌ر هه‌موو شتێكدا هه‌یه ـ دروستی كردوون ، وه هه‌ر ته‌نها ئه‌و خواوه‌نده‌یشه كه به حیكمه‌تی خۆی به یه‌كیانه‌وه ده‌به‌ستێته‌وه‌و ، هــه‌ر ته‌نهــا ئه‌ویشه كــه به‌ویستی خــۆی سرووشتی شته‌كانیشی دیاری كردووه‌و كردوویه‌تی بــه ئاوێنه‌یه‌ك بۆ تێشكدانه‌وه‌و دره‌وشانده‌نه‌وه‌ی شه‌ریعه‌ته فیطریه گه‌وره‌كه‌ی خۆی ، كه بریتیه له‌و یاسا كارگێرانه‌ی خواوه‌ند كه تایبه‌تن به رێكخستنی كاروباره‌كانی كه‌ونه‌وه •• هه‌ر ئه‌و خواوه‌نده‌یه كه به توانستی خۆی رووی سرووشتی به جۆرێ به‌دیهێناوه كــه رووه‌و بوونی ده‌ره‌كیی بینــراو ( الوجود الخـارجي المشهود ) بروانێو ، هه‌موو به‌دیهێنراوه‌كانی له‌سه‌ر ئه‌و سرووشته داناوه‌و تێكه‌ڵی یه‌كتری كردوون •



ئێستاش عەقلی سەرگەردانی خۆت لەم کارەدا دەکەینە سەرپشك ، با بە چاوی ئینسافەوە سەیر بکات ، با بزانین عەقڵت کامیان وەردەگرێ‌و بە ئاسانی باوەڕی پێ دەکات ..

ئایا باوەڕ بەم حەقیقەتە مەعقوولە دەکات ، کە لە چەندین بەڵگەی بەهێزی لە ژمارە بەدەرەوە پەیدا بوون ، کە قەناعەت بە مرۆڤ دەبەخشن ..

یان باوەڕ بەوە دەکات کە : بوونی هەر شتێك لەگەڵ ئامێرو ئەندامە لە ژمارە بەدەرە پێویستەکانی‌و چەند کردارێکی ئەوتۆ کە ڕوخسارو شەقڵی حیکمەت‌و بەسیرەتیان پێوە دیارە ؟ هەموو ئەمانە بدرێنە پاڵ « سرووشت » تا پێیان هەڵبسێ ، یاخود بگێڕرێتەوە بۆ ئەو ماددە ڕەق‌و تەق‌و بێ گیان‌و هەست‌و بەدیهێنراوە ساکارەی کە ناوی «سرووشت»ی لێ دەنێن ؟!

ئایا ئەمە خورافەتێکی مەحاڵ‌و دوور لە بازنەی گونجانی عەقڵی‌یەوە نیەو بە هەزاران جاریش ؟

کابرای کەللەڕەقی سرووشت‌پەرست ، لەوەڵامدا دەڵێ :

ـ « مادەم داوات لێ کردم ئینساف بەکار بهێنم ، ئەوا دان بەوەدا دەنێم کە ئەو ڕێگە سەر لێ‌تێکدەرەی تا ئێستا گرتبوومانە بەر هەروەك دەیان مەحاڵی تێدایە ؟ هەروەها تا بشڵێی زیان بەخشە . لە ڕاستیدا لەو پەڕی ناشیرینی‌و بێ‌کەڵکی‌دایە . هەر کەسێکیش ئەوەندەی تۆزقاڵێك دارای هەست‌و شعوورو ژیری بێ ، لەو لێکۆڵینەوە زانیاری‌یانەی کە ئێوە باستان کردو کە پاڵیان بە بەڵگەی پتەوەوە داوەتەوە ، تێدەگات کە گێڕانەوەی دروست کردن‌و بەدیهێنانی شتان

بۆ سرووشتو هۆکان بە لای عەقڵەوە تا بلێی مەحاڵو نەگونجاوە • •
بەڵکوو عەقڵی کامڵ بەلایەوە واجبو پێویستە کە بەدیهێنانی هەرچی
شت هەیە یەکسەر بدرێتە پاڵ خواوەندی « واجب الوجود » •

« کەوانە سوپاسێکی زۆر پێشکەشی ئەو خوایە دەکەم کە ڕێگای
ئەم ئیمانە پاکو بێ گەردەی پیشان داموو ، ئەم ئیمانەی پێ بەخشیم •

« بەڵام تەنها یەك شوبهەم ماوە ، ئەویش ئەمەیە :

« من باوەڕم بەوە هەیە کە خوا پەروەردگارو بەدیهێنەری هەموو
شتێکە ، بەڵام ئایا چ زیانێك لە گەورەیی‌و سەڵتەنەتی ئەو خواوەندە
دەکەوێت کە ئەگەر مەدحو ستایشی چەند هۆیەکی هەندەکی بکرێت
لەسەر بەدیهێنانیان بۆ چەند شتێکی کەم نرخ ؟ ئایا ئەم کارە هیچ
شتێك لە دەستەڵاتی بە توانای خوای گەورە کەم دەکاتەوە ؟ »

وەڵام :

هەروەك لە هەندێ پەیامدا چەسپاندوومانە سیفەتی فەرمانڕەوایەتی
( الحاکمیة ) بە چەشنێکە کە هەرگیز ڕێگا بە هیچ کەس‌و هیچ شتێك
نادات کە دەست بخاتە ناو کاروبارەکانیەوەو خۆی تێاهەڵبقورتێنێ •
کە ئەمەش پێی دەڵێن : « رد المداخلة » واتە : ڕەتکردنەوەی دەست
تێوەردان •• بگرە لەناو مرۆڤیشدا بچووکترین کاربەدەست یان هەر
فەرمانبەرێکی ئاسایی ، لە چوارچێوەو سنووری فەرمانبەرێتی‌و
فەرمانڕەوایەتی‌ی خۆیدا دەرفەت بە کوڕی خۆیشی نادات دەست بخاتە
ناو کاروبارەکانیەوە • بگرە لەوەش زیاتر ڕووی داوە ، ئەوەتا هەندێ
لەو سوڵتانانەی بە وەهمو خەیاڵیاندا هاتووە کە گوایا کوڕەکانی خۆیان
دەست دەخەنە ناو کاروبارەکانیانەوە ؟ یەکسەر ئەو کوڕە بێ تاوانانەی

خۆیان کوشتووە ، هەر چەندەش خاوەنی تەقواو پەرستش‌و خەلیفەی موسڵمانانیش بوون ! ئەمەش ڕادەی ڕەسەنایەتیی یاسای «رد المداخلة»مان لە بواری فەرمانڕەوایەتیدا بۆ ڕوون دەکاتەوە •

ئەم یاسایە هەر لە دوو کەسەوە کە لەسەر بەڕێوەبردنی ناوچەیەکی بچووکەوە دەبێتە هەرایان ، تا دەگاتە دوو سوڵتان کە فرەیان لەسەر کاربەدەستیی وولاتێك بێت‌و هەر یەکەی بیەوێ بۆ خۆی ڕایبکێشێ ، دەگرێتەوە •

هەروەها یاسای « نەهێشتنی هاوبەش » کە [ یاسایەکی ترەو ] یەکتابوون لە دەستەڵاتدا ( التفرد بالسلطة ) داخوازیەتی ، ئەم یاسایەش لە درێژاییی مێژووی مرۆڤدا ، بە کوشتن‌و برین‌و ناکۆکی‌و خوێن ڕشتن ، هێزو دەستەڵاتی خۆی سەپاندووەو سەقامگیری کردووە •

ئنجا تۆیش وەرەو سەرنجی ئەم مرۆڤە بدە ( کە لە ڕاستیدا بەڕێوەبردنی خۆی لە تواناداا نییەو ، پێویستی بە یارمەتیی خەڵکی هەیەو ، تەنها سێبەرێکی لاوازی فەرمانڕەوایی‌و کاربەدەستی نەبێ هیچی تر شك نابات ) ، کەچی تا ئەو ڕادەیەی پێیمان دەرفەت بە هیچ کەسێك نادات کە دەست بخاتە ناو کاروبارەکانیەوەو بە شداریی فەرمانڕەوایەتی بکات‌و بە هەموو هێزێکیشیەوە هەوڵی سەربەخۆییی خۆی دەدات ••

سەرنجی ئەمە بدەو ئنجا وەرە بیرێك لە فەرمانڕەوای موتڵەق بکەرەوە ، کە خاوەنی عەرشی پەروەردگاریتی‌یەو ، هەر خۆی خاوەن فەرمانەو ، خواوەندی هەموانەو ، هەر تەنها ئەو سەربەخۆی تاك‌و تەنهایەو ، دەستەڵاتێکی ڕەهای وایشی هەیە کە هەرگیز پێویستی بە هیچ

شتێك نیە .. وەرە بیرێك لەمە بکەرەوەو ئنجا بزانە کە دەبێ سەبارەت بەم پەروەردگارو خواوەندە زولجەلالەوە چەند شتێکی حەتمی بێ کــە هەرگیز ڕێــگا بە هاوبەش نەدات‌و نەیەڵێ هیچ کەسێك دەست بخاتە ناو کاروبارەکانی‌و لە فەرمانڕەوایەتی‌یە ڕەواکەیدا بەشداری‌ی بـکات ؟ ئایا ئەم هاوبەش نەبوونــە چــەندە داخوازی‌یەکی ڕەواو حەتمی‌ی ئـــەو پەروەردگاریتی‌یەیە ؟

جا ئەگــەر توانای بەراوردکاری لە خۆتدا شك دەبەیت ، فەرموو ئەم دوو کارە لەگەڵ یەکدا بەراوورد بکە !

ســەبارەت بە کــەرتی دووهەمی شوبهەکەیشەوە کە دەڵێ : ئەگەر هەندێ لە هۆکان ببنە سەرچاوی هەندێ پەرستنی ئەوتۆ کە هەندێ شتی بچووك‌و هەندەکی دەیکەن ، واتە ئەگــەر هەندێ پەرستنی ئاراستەی هەندێ لە هۆکان بـکرێن ، چ کەم‌و کوڕی‌یەك بەو پەرستنە زۆرانەی هەموو بوونەوەران دەگەیەنێت ، کــە هەر لە ئەتۆمەکانەوە تا دەگـــانە ئەستێرەو قەبارەکانی ئاسمان‌و کاکێشان لە بەرامبەر خواوەندی گەورەو پەرستراوی ڕاستەقینەوە دەیانکەن‌و ئەنجامیان دێنن ؟

وەڵام :

خواوەندی خـــاوەن زانست‌و حیکمەت ئـــەم بوونەوەرەی وەك دەرەختێـکی گەورە دروست کردووە ، خـاوەن هەست‌و شعوورەکانیشی کردووە بە میوەو بەروبوومی ئەو دەرەختــە . وە لەبەر ئەوەی مرۆڤیش سەرجەمترین بەروبوومی نێـوان خـاوەن هەست‌و شعوورەکانە ، ئـەوا ڕێزێـکی زۆری لێناوە ، وە شوکرانەو پەرستش کردنی ئـەم مرۆڤـەشی کردووە بە گرنگترین‌و بەرزترین میوەو بەروبوومێك کــە ژیانی مرۆڤ

دەیگرێت‌و بەرهەمی دێنێ • بگرە ئەم دووانە [ واتە شوکرانەو پەرستش ] ئەنجام‌و مەبەستی دروست بوونی ئەم مرۆڤەن •• جا ئایا دەگونجێ ئەم خواوەندە فەرمانڕەواو تاك‌و تەنهایە کاروباری ئەو مرۆڤەی کە بەروبوومی هەبوو بوونەوەرانە ، بداتە دەست غەیری خۆی ؟ یان بەروبومی ژیانی مرۆڤ [ کە شوکرانەو پەرستشە ] بە دەستی غەیری خۆی بسپێرێ ؟ پاش ئەوەی کە هەموو کەونی بۆ ئەوە دروست کردووە کە خوایەتی‌ی خۆیان پێ بناسێنێ‌و پەروەردەگاریتی خۆیان لەبەر چاودا خۆشەویست‌و شیرین بکات ؟

ئایا دەگونجێ ئاکامی بەدیهێنان‌و بەروبوومی بونەوەر بەرەو بێ‌مەبەستی ( العبث ) بڕوات ؟

نەخێر •• هەرگیز وا نیەو وا نابێ ••

باشان ئایا دەگونجێ خواوەند شتێك بە پێچەوانەی حیکمەتی ڕەهای خۆی بکات ، بەوەی کە بە شتێك ڕازی بێ بەنجە بۆ ئینکاری کردنی خوایەتی‌ی ئەو درێژ بکات ، واتە ڕێگا بە غەیری خۆی بدات تا ئینکاری‌ی پەروەردگاریتی بکەن ؟ لە کاتێکدا کە ئەم خواوەندە گەورەیە لە ڕێگای کردارەکانی‌و لە ڕێگای خۆ خۆشەویست کردنیەوە ـ کە بە هۆی بلاوکردنەوەی بەدیهێنراوەکانیەوە دەیکات ـ خۆیمان پێ دەناسێنێ ؟

ئایا دەگونجێ ڕێگا بە دروستکراوەکانی خۆی بدات کە خوای خۆیان لە یاد بکەن‌و ئینکاری‌ی مەبەستە بەرزەکانی بەدیهێنانی بوونەوەر بکەن ؟ بەوەی کە دەرفەت بە غەیری خۆی بدات ، تا لە لای کامڵترین‌و بەڕێزترین بەدیهێنراوی ئەم خوایە ـ لە ڕووی پەرستش‌و شوکرانە

کردنەوە ـ خۆیان خۆشەویست بکەن ؟

نەخێر هەرگیز شتی وا ڕوو نادات •

★ ★ ★

ئێستاش ئەی ئەو برادەرەی وازی لە سرووشت پەرستن هێناوە !

ئەوەی دەتەوێ بیڵێی ، فەرموو بیڵێ‌و باسی بکە •

ئەویش دەڵێت :

ـ • سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ئەم دوو شوبهەیەی وا بە ئاسانی بۆ حەل کردم‌و تاوانەکانیشیانی لێ دوورخستمەوە • ئیتر بە تەواوی لەوە دڵنیا بووم کە جگە لە زاتی خوای گەورە هیچ شتێک‌و هیچ کەسێک شایانی تاک‌و تەنهایی‌و پەرستش نیە کەواتە جگە لەو کەسی تر خوا نیە •• بە ڕاستی دوو بەڵگەی تەوتۆت بۆ ڕوونکردمەوە کە هەرگیز ئینکاری ناکرێن ، مەگەر لە لایەن یەکێکەوە کە ئینکاری‌ی ڕۆژی ڕۆشناو خۆری ناو جەرگەی ئاسمان بکات • •

## پاشەکی :

ئەم مرۆڤەی کە وازی لە بیرو باوەڕی مولحیدانەی «سروشت» هێناو هاتە ناو بازنەی ڕێڕەوی ئیمانەوە ، دەڵێ :

« سوپاس بۆ خوا هیچ شوبهەیەکم لە دڵدا نەماوەو هەموویان ڕۆشتن • بەڵام چەند پرسیارێکم هەیە سەرم تیایاندا سوڕماوەو سەرنجم ڕادەکێشن :

• پرسیاری یەکەم :

• زۆبەی ئەوانەی کە تەمەنۆو کەم تەرخەمن و وازیان لە نوێژکردن هێناوە ، لێیان دەبیستین دەڵێن : خواوەندی پەروەردگار چ پێویستی‌یەکی بە پەرستنی ئێمە هەیە ؟ ئەوەتا لە قورئانی پیرۆزدا بەو بەڕی توندو تیژی‌یەوە هەڕەشە لەوانە دەکات کە واز لە پەرستش دێنن ، وە بە سزای پڕ لە ئێش و ئازاری وەك دۆزەخ دەیانترسێنێ •• باشە ئایا ئەو شێوازە ڕێك و ڕەوان و لەسەرخۆو پڕ لە ئیعجازەی قورئان چۆن لە گەڵ ئەم شێوازە پڕ لە توندو تیژی‌یەدا دەگونجێ کە یەکپارچە هەڕەشەو گوڕەشەی توندو تیژە لە بەرامبەر تاوانێکی بچووك و هەندەکی‌ی کەم نرخەوە ؟ • •

وەڵام :

ڕاستە هەرگیز خوای گەورە هیچ پێویستی‌یەکی بە پەرستنی تۆ نیە ، بگرە هەرگیز پێویستی‌ی بە هیچ شتێك نیە . بەڵکوو تۆ پێویستیت بە پەرستنی ئەو هەیە ، چونکە تۆ دووچاری نەخۆشی‌یەکی مەعنەوی بوویت ، پەرستنیش مەڵهەمێکی سارێژکاری ئەو نەخۆشی‌یەیەو ، دەرمانێکە دژی ژەهرەکانیەتی .

ئەمەشمان لە زۆر پەیامدا چەسپاندووە ، نموونەکەیشی بەم جۆرەیە :

ئەگەر بێت‌و پزیشکێکی دڵسۆزی میهرەبان‌و بە شەفەقەت بە نەخۆشێکی خۆی بڵێ : ئەم دەرمانە شیفا بەخشە بخۆ ، کەچی نەخۆشەکە لە وەڵامدا پێی بڵێ : بۆچی وا بە گەرمی داوای خواردنی ئەم دەرمانەم لێ دەکەیت ؟ تۆ حەقت چیە بەسەرمەوە ؟..

ئایا ڕادەی بێ نرخی‌ی قسەی کابرای نەخۆشت بۆ دەرناکەوێ ؟

سەبارەت بە قورئانی پیرۆزیشەوە کە بە سزای ئازاردار هەڕەشە لەوانە دەکات واز لە پەرستش دێنن ، ئەوا بە نموونەیەك ڕروونی دەکەینەوە :

هەروەك سوڵتان تۆڵەی توندو تیژ لەو کەسە دەسێنێتەوە کە بە تاوانێکی وا هەڵسابێت مافی خەڵکی تیا پێشێل کردبێت لە پێناوی پاراستنی ژیان‌و مافی هاووڵاتیانی خۆی‌و ئەوانەی لە ژێر دەستی حوکمداری‌و فەرمانڕەوایەتی‌ی ئەودان ؟ هەروەك ئەم سوڵتانە ئەم کارە دەکات‌و ئەو تۆڵەیە دەسێنێتەوە ، هەروەها خاوەندی گەورەش کە سوڵتانی ئەزەل‌و ئەبەدە ـ سزای توندو تیژی ئەوانە دەدات کە وازیان

له نوێژو پەرستش هێناوە ٠ چونــکە بەم وازهێنانە دەست درێژیو ستەم لە بوونەوەران دەکــەنو مافیان دەخۆن ٠ ئەو بوونەوەرانەی کە لە ژێر حوکمداریو فەرمانڕەوایی ئەو خوایەدان ، کەماڵاتیان لــە شــێوەی تەسبیحاتو پەرستشدا دەردەکەوێ ، کە بەو ڕوومیان ڕووی لــە خوای بەدیهێنەرو خاوەن حیکمەتە ، ئەم تەسبیحاتو پەرستشانە دەردەبڕن ٠٠

جــا ئەو کەسەی وازی لــە پەرستش هێناوە ، نە پەرستشی ئەو بوونــەوەرو بەدیهێنراوانە دەبینێ ، وە نــە دەشتوانێ بیــانبینێ ، بــگرە ئینــکاریی پەرستشیشیان دەکــات ٠٠ جا کە ئەو پەرستشانەشی نەبینیو ئینکاریشی کردن ؛ ئەوا لــە نرخو بایەخی ئەم بوونەوەرانەی کە لە بارەی پەرستشو تەسبیحاتەوە هەر یەکەیان نووسراوێــکی خواییو ئاوێنەیەکی درەوشاندنەوەی ناوەجوانەکانی پەروەردگارن ، کەم دەکاتەوەو بایەخیان ناداتێو لــەو پلەو مەقامــە بەرزەی خۆیانەوە دایاندەگرێو بە ووشكو ڕەقو تەقو بێفەرمانبەریو بێ مەبەستیان دەزانێ ٠٠ ئەم کارەش ئەوە دەگەیەنێ کــە ئەو مرۆڤە دوور لە پەرستشە گــاڵتە بــە بوونەوەرانو ئینکاریی کەماڵاتیان دەکاتو دەست درێژی دەکاتە سەرمافەکانیان ٠٠

بەڵێ ، هــەر مرۆڤێك کە دەڕوانێتە ئەم گەونە ، ئەوا بە دووربینی تایبــەتیی خۆیو لــە ڕوانــگەی درەوشاندنەوەی ئاوێنە تایبەتیەکەی خۆیەوە بۆی دەڕوانێ ٠ چونــکە خواوەندی بەدیهێنەر مرۆڤی لەســەر شێوەی تەرازووی ئەم گەونە دروست کردووە ، کــە بــە هۆی ئــەم تەرازووە کە لە خۆیدایە بتوانێ هەموو کاروبارێك بەراوورد بــکات ، وە خواوەندی گەورە جیهانێکی تایبەتیی بە هــەموو مرۆڤێك بەخشیوە لــەم جیهانە گــەورەو گشتییەدا ٠٠ جیهانی تایبەتیی هەرکەسێکیش بە گوێرەی ڕەنــگدانەوەی بــیروباوەڕە تایبــەتییەکەی دڵو دەروونــی

خۆیەتی • دەبینین ئەو کەسەی نائومێدو خەفەتبارە ، بوونەوەریش لەبەر چاویا لە گریان‌و خەفەتباریدایە • بەڵام مرۆڤی بەختەوەرو دڵخۆش ، بوونەوەرانی بە دڵخۆش‌و دەم بە پێکەنینەوە دێتە بەر چاو •

هەر بەم چەشنەیش ، ئەو کەسەی کە بەتێفکرین‌و هەست‌و شعووری تەواو و سەرنج‌و لێبڕانەوە پەرستشەکانی خۆی بەجێ دەهێنێ ؛ شتێکی لە پەرستشە حەقیقی‌و گومان لێنەکراو و چەسپاوەکەی بوونەوەران بۆ دەردەکەوێ •• بەڵام ئەوەی وازی لە پەرستش هێناوەو بێ ئاگایە لێی‌و ئیکارەی دەکات ، ئەوا وەهمێکی هەڵەی لە مێشکی خۆیدا بۆ بوونەوەران بڕیار داوە کە تا بڵێی پێچەوانەی حەقیقەتی ئەو بوونەوەرانەیە • ئەمەش دەست درێژی کردنێکی مەعنەوی‌یە بۆ سەر مافی ئەو بوونەوەرانە •

لەوەش زیاتر لە مرۆڤی نوێژنەکەرەوە ڕوو دەدات • چونکە کابرای نوێژ نەکەر تەنها بەوەندەوە نەوەستاوە کە باسمان کرد ، بەڵکوو ستەم لە خۆیشی دەکات کاتێ کە واز لە نوێژ کردن دێنێ ، چونکە خۆی خاوەنی زاتی خۆی نیە تا بە سەربەستی بجووڵێتەوە ، بەڵکوو بەندەیەکی خاوەندارە لە خزمەت خاوەنەکەی خۆیدا • خۆ دیارە ئەم بەندەیەش بە ئەرکی بەندایەتی هەڵنەساوە ، ئیتر لەبەر ئەوەیە کە خاوەنەکەی خۆی هەڕەشەی توندو تیژی لێ دەکات ، تا مافی بەندەکەی خۆی لە ( نەفسی ئەممارەی ) ئەو بەندەیە بسێنێتەوە •

جگە لەمانەش ، کاتێ ئەو بەندەیە واز لە پەرستش دێنێ ، ئەو پەرستشەی کە ئاکام‌و پوختەی مەبەستی بەدیهێنانی بوونەوەرانە ، مانای وایە لە سنووری خۆی دەرچووەو دەست درێژی کردووەتە سەر حیکمەتی خواوەندو ویستی پەروەردگار ••

کەواتە دەبێ لەسەر هەموو ئەمانە سزای توندو تیژ بدرێ • لەمانەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە :

ئەو کەسەی واز لە پەرستنی دێنێ هەروەك ستەم لە خۆی دەکات لە کاتێکدا کە خۆی بەندەی خواوەندە لەهەمان کاتیشدا دەست درێژی دەکاتە سەر مافی کەمالاتی بوونەوەرانو ، ستەمیان لێ دەکات •

بەڵێ ، هەروەك کافرێتی بریتی‌یە لە بێ‌نرخ زانینی بوونەوەرانو کاڵتە پێ‌کردنیان ، واز هێنانیش لە پەرستنی بریتی‌یە لە ئینکاری کردنی کەمالاتی بوونەوەرەرانو دەست درێژی کردن بۆ سەر حیکمەتی پەروەردگار ، هەر لەبەر ئەوەیشە کە شایستەی ئەوە دەبێ هەڕەشەی توندو تیژی لێ بکرێو سزای بەئازاریش بدرێ •

کەواتە قورئانی پیرۆز شێوازی هەڕەشەو ترساندنی بۆ ئەوە گرتووەتە بەر کە ئەم شایستەیی‌یەو ئەو حەقیقەتە ناو براوانە دەربڕێ • کەواتە ئەم شێوازەی قورئان شێوازێکە تا بڵێی پڕ لە ئیعجازەو ، لەگەڵ داخوازیی حالو مەقامدا کە بەلاغەتی ڕاستەقینەی قورئانە تا بڵێی گونجاوە •

پرسیاری دووهەم :

ئەم مرۆڤەی کە وازی لە « سروشت » هێناو ئێستا بە بەختەوەریی « ئیمان » شادبوو ، دەڵێ :

« گوێ ڕایەڵیی هەموو بوونەوەر ( موجود )ێك ، لە هەر جێگایەکدا بێت ، وە لە هەموو کاروبارێکی خۆیداو لە هەموو ئیشێکیدا کە پێی هەڵدەستێ ؛ گوێ ڕایەڵیی ئەم بوونەوەرە بەو جۆرە بۆ ویستی خوایی‌و توانستی پەروەردگاری ، لە ڕاستیدا حەقیقەتێکی تا بڵێی

گەورەیە ، وە هەر لەبەر فراوانیو گەورەییەکەیشیەتی کە لە زەینی کولو کورت بینی ئێمەدا جێگای نابێتەوە .. لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە بە چاوی خۆمان زۆرییەکی زۆر لە بەدیهێنراوانو ، ئاسانییەکی ڕەها لە دروست بوونیاندا دەبینین ، وە ئەم ئاسانیبەش کە لە بەدیهێناندا هەیە ، لە ڕێگای ئەو بەڵگە پتەو و زۆرانەی ئێوەوە بۆمان ساغ بووەوە ، کە چەسپاندیان ئەو ئاسانییە لەوەدایە کە ئەوبوونەوەرانە تەنها یەك بەدیهێنەریان هەیە ، بۆیە وا ئەو ئاسانییەیان لە دروست بووندا بۆ ڕەخساوە . ئەمە سەرەڕای ئەوەش کە قورئانی پیرۆز لە چەندین ئایەتدا بە سەراحەت ئەم حەقیقەتەی بڕیار داوە . وەك ئەم ئایەتانەی کە دەفەرموون :

« ما خلقكم ولا بعثكم الا كنفس واحدة »

( سورة لقمان/٢٨ )

« وما أمر الساعة الا كلمح البصر أو هو أقرب »

( سورة النحل/٧٧ )

« هەموو ئەمانە وا لەو حەقیقەتە دەکات [ واتە ئاسانیی بەدیهێنان ] کە بە لای عەقڵەوە مەسەلەیەکی ئاسانو وەرگیراو بێت .. باشە ئایا چ (نهێنی)یەك لەم ئاسانییەدا هەیەو ، چ (حیکمەت)ێکی تێدا شارراوەتەوە ؟! »

وەڵام :

ئەو (نهێنی)یە لە ووتەی دەهەمی مەکتووبی بیستەمە بە تایبەتی لە باشکۆکەیدا کە شەرحی « وهو علی كل شیء قدیر » دەکات ، زۆر بە ڕێكوپێکیو بە چەشنێکی قەناعەتدەرو شیفا بەخش ڕوون بووەتەوەو بە جوانی چەسپێنراوە کە :

هەرکات بەدیهێنانی بوونەوەران بە گشتی بدرێتە پاڵ بەدیهێنەری تاکو تەنها ، ئەوا بە ئەندازەی بەدیهێنانی یەکێکیان ئاسان دەبێت • بەڵام هەرکات بەدیهێنان نەدرێتە پاڵ بەدیهێنەری تاکو تەنها ، ئەوا ئەو کاتە بەدیهێنانی تاکە یەك شت بە قەدەر بەدیهێنانی هەموو بوونەوەران گران‌و قورس دەبێت • واتە بەدیهێنانی (تۆو)ێك بە ئەندازەی بەدیهێنانی (درەخت)ێك قورس‌و گران دەبێت • بەڵام لە کاتی گێڕانەوەی دروستکردندا بۆ بەدیهێنەری تاکو تەنهاو ڕاستەقینەی خۆی ، کارەکە ئەوەندە ئاسان دەبێت کە بەدیهێنانی هەموو بوونەوەران وەك بەدیهێنانی یەك درەخت‌و ، درەختێکیش وەك یەك دانە ( تۆو ) و ، بەهەشتیش وەك وەرزی بەهارو ، بەهاریش وەك تاقە گوڵێکی لێدێت‌و ئاسان دەبێت •

وا ئێستاش لە نێوان سەدان بەڵگەدا کە لەپەیامەکانی نردا ڕوون کراونەتەوە ، پەنجە بۆ یەك دووبەڵگە درێژ دەکەین لەو بەڵگانەی کە ئەو نهێنی‌یە شاراوەیە ڕوون دەکەنەوە کە لە زۆری‌ی ئەو بوونەوەرەلەژمارە بەدەرانەی بەرچاومان‌و زۆری‌ی تاکەکانی ئەو جۆرانەو ، لە دروستبوونیاندا بەو پەڕی ئاسانی‌و لەو پەڕی ووردەکاری‌و ڕێك‌وپێکی‌دا ، هەیە •

ئەمەش یەکێکە لەو نموونانە :

بەڕێوەبردنی ( سەد ) سەرباز لە ژێر فەرمان‌و چاودێری‌ی یەك ئەفسەردا ، سەد ئەوەندەی ئەوە ئاسانە کە بەڕێوەبردنی ( یەك ) سەرباز بە ( سەد ) ئەفسەر بسپێردرێ •

هەروەها ، هەرکات دابین کردنی پێداویستی‌یە سەربازی‌یەکانی سوپایەکی تەواو لە یەك کارگەو مەڵبەندا بێت‌و بە یەك یاساو یەك

فەرمان ڕوو بدات کە یەك پێشەوا دەری بکات ، ئەم کارە ، لە ڕوانگەی چەندایەتی‌یەوە ، بە ئەندازەی دابین کردنی پێداویستی‌ی یەك دانە سەرباز ئاسان دەبێت .. کەچی دابین کردنی پێداویستی‌ی یەك سەرباز لە چەند کارگەو مەڵبەندێکی جیاجیاو بە فەرمانی چەند پێشەوایەك ، هەر لە ڕوانگەی چەندایەتی‌یەوە ، بە ئەندازەی دابین کردنی پێداویستی‌ی سوپایەکی سەربەخۆو تەواو ، گران‌و قورس دەبێت . چونکە ئەو کاتە دابین کردنی پێداویستی‌یە سەربازی‌یەکانی یەك تاکە سەرباز ، بە ئەندازەی پێویستی‌ی هەموو سوپا پێویستی‌ی بە کارگەی جۆراو جۆر دەبێ .

هەروەها بە چاو دەبینرێ هەزاران دانە میوەو بەروبووم کە تەنها یەك درەخت دەیانگرێ ، تەنها لە یەك ڕەگ‌و یەك مەڵبەندو بە بڕی یەك یاسا مادده پێویستی‌یەکانی خۆیان وەردەگرن‌و ، ئەمەش ئەوەندە بە سووك‌و ئاسانی تەواو دەبێ ، وەك بڵێی ئەو درەختە تەنها یەك دانە بەری گرتبێت .. ئەمەش بە هۆی (نهێنی)ی «تاك بوون ـ الوحدة»وە . بەڵام ئەگەر بێت‌و ئەم تاك بوونە لا ببرێ‌و « زۆری ـ الکثرة » لە جێگایدا دابنرێ ؟ واتە ئەگەر بێت‌و هەر یەك لەو میوەو بەروبوومانە مادده پێویستەکانی خۆی لە چەند مەڵبەندێکی جیا جیادا وەربگرێ ، ئەوا ئەو کاتە بەدیهێنانی یەك دانە بەر بە ئەندازەی بەدیهێنانی درەختێك گران‌و پڕ لە گیروگرفت دەبێ . بگرە بەدیهێنانی ( تۆو ) ، کە نموونەو پێرستی درەختێکە ، بە قەدەر خودی درەختەکە قورس‌و گران دەبێت . چونکە ئەو ماددانەی کە بۆ ژیانی درەختەکە پێویستن ؟ هەر هەمان ماددەیشن کە بۆ ژیانی تۆوەکە پێویستە بن .

سەدان نموونەی تری هاوچەشنی ئەم نموونانە هەن ، وە هەر

هەمووشیان ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە : پەیدا بوون و دروست بوونی هەزاران بەدیهێنراو لە ڕێگای تاك بوون «الوحدة»ەوە زۆر زۆر لەوە ئاسانترە کە تەنها یەك بەدیهێنراو لە ڕێگای ( زۆری ) و ( هاوبەش ) بوونەوە بێتە ناو جیهانی بوون و بەدی بهێنرێ ٠

جا لەبەر ئەوەی ئەم حەقیقەتەمان لە چەندین پەیامی تردا بە چەشنێکی گومان لێنەکراو چەسپاندوە ، ئەوا خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی ئەو پەیامانە دەکەین ٠٠ بەڵام لێرەدا تەنها یەك (نهێنی)ی گەورە باس دەکەین کە پەیوەندیی بەم ئاسانییەوە هەیەو ، لە ڕوانگەی « زانست » و « قەدەر »ی خواو «توانست»ی پەروەردگارەوە دەڕوانێتە مەسەلەکە :

هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە تۆ وەك مرۆڤێك هەیت ، وە یەکێکی لەو بوونەوەرانەی کە خاوەنی «بوون»ن ٠ ٠

جا ئەگەر خۆت تەسلیمی خواوەندی خاوەن « توانستی ڕەها » بکەیت ؛ ئەوا لە ماوەی چاوتروکاندنێکدا لە هیچ و (نەبوون)ەوە بە فەرمانێکی ئەو ، وە بە دەستی قودرەتی ئەو ، دروست دەبیت و «بوون»ت پێ دەبەخشرێ ٠٠ بەڵام ئەگەر خۆت تەسلیمی ئەو نەکەیت و بەدیهێنانی خۆت بۆ هۆ ماددییەکان بگێڕیتەوەو خۆت تەسلیمی « سروشت » بکەیت ، ئەوا بۆ بەدیهێنانی تۆ [ کە تەنها یەك کەسیت ] دەبێ هەموو ماددە پێویستەکانی پەیدابوونت لە هەموو جیهان و هەموو کەوندا کۆ بکرێنەوەو ، لە چەندین پاڵێوگە (المصفی)دا بپاڵێورێن و بە چەندین تاقیکردنەوەی جۆراو جۆردا تێپەڕ بن و بە چەندین تەرازووی وردی هەستیار بکێشرێن ٠ چونکە تۆ بوختەیەکی ڕێك و پێك و ، بەروبوومێکی پێگەیشتوو و ، پێرستێکی بچووکی هەموو

ئەم کەونەیت ، وە لیستەیەکیت کە هەموو ماددەکانی کەونی تیدایە •

بەڵێ ، ئەم گەڕان‌و پشکنین‌و کۆ کردنەوەیە [ ئەو کاتە ] شتێکی پێویست دەبێ • چونکە هۆ ماددی‌یەکان تەنها کۆ کردنەوەو پێك دێنان ( الجمع والترکیب ) ئەبێ هیچی تریان لە توانادا نیە • لە لای زیران‌و خاوەن هەستانیش چەسپاوە کە هۆ ماددی‌یەکان ناتوانن هیچ ماددەیەك لە ەنەبوون‌ەوە دروست بکەن‌و ەبوون‌ەی پێ ببەخشن •• جا لەبەر ئەوەی هۆ ماددی‌یەکان شتی وایان لە توانادا نیە ، ئەوا چار نیە دەبێ بۆ دروست کردنی تەنی هەر زیندەوەرێك [ ئەگەر وا دابنرێ تەنی هەر زیندەوەرێك هۆ ماددی‌یەکان دروستی دەکەن ] ئەو ماددانەی پێویست دەبن • لە هەموو سووچ‌و جێگایەکی جیهاندا کۆ بکرێنەوە ••

ئیتر تۆیش دەتوانی لەم نموونەیەوە ڕادەی ئەوئاسانی‌یە بزانیت کە لە ڕێگای ( یەك بوون ) و ( یەکتاپەرستی ـ التوحید )دا هەیەو ، ە ڕادەی گرانی‌و گیروگرفتی بەدیهێنانیش تێ بگەیت کە لە ڕێگای (هاوبەش بڕیاردان ـ الشرك ) و ( گومڕایی ـ الضلالة )دا هەیەو دێتە کایەوە •

دووهەمیان :

لە ڕوانگەی ( زانستی ) خوایشەوە ئاسانی‌یەکی ڕەها [ لە بەدیهێناندا ] هەیە • ئەویش • بەم جۆرەی خوارەوەیە •

« قەدەری خوا » جۆرێکە لە « زانستی خوا » ئەم قەدەرە ئەندازەی هەموو شتێك لەو زانیاری‌یەدا دیاری دەکات ، وەك بلێی قاڵبێکی مەعنەوی‌و تایبەتی‌ی ئەو شتەیە • کەواتە ئەو ئەندازەیەی کە لە قەدەری خوادایە وەك نموونەو نەخشەی ئەو شتە وایە کە لە

زانستی خوادا دیاری کراوەو لە پاشاندا بەدی دەهێنرێ .. جا هەرکات کە توانستی خوائەو شتە بەدی دەهێنێ ئەوا لەسەر ئەو ئەندازەیە بەدی ی دەهێنێ کە زووتر ( قەدەری خوا ) نەخشەی بۆ کێشابوو ، وە ئیتر بەوپەڕی ئاسانی یەوە دروست دەکرێ‌و بەدی دەهێنرێ .

جا ئەگەر بێت‌و دروست کردنی ئەو شتە لە نەبوونەوە نەدرێتە پاڵ ئەو خوایەی کە خاوەنی زانستێکی ڕەهاو ئەزەلی‌و گەورەیەو خاوەندی بە توانست‌و ذوالجلاله ؟ ئەوا نەك تەنها هەزاران گیروگرفت پەیدا دەبێ‌و بەس ، بەڵکوو سەدان مەحاڵیش ڕوو دەدات . چونکە ئەگەر بێت‌و ئەو ئەندازەیەی کە لە ( قەدەر ) و ( زانستی ) خوادا دیاری کراوە ـ وەك لە حاڵەتی یەکەمدا هەیە ـ لەکایەدا نەبێ ، ئەوا دەبێ هەزاران قاڵبی ماددی‌و خاوەن وجوودی خاریجی لە تەنی بچووکی ئەو زیندەوەرەدا بەکار بهێنرێ !

دەسا تۆیش ـ کاکی خۆم ! ـ لەم نموونەیەوە لەو ئاسانی یە ڕەهایە تێ بگە کە لە دروستکردندا هەیە کاتێ ڕێگای یەکتایی ( التوحید ) لەم مەسەلەیەدا ڕەچاو دەکرێ . هەروەها لەو گیروگرفتانەش تێ‌بگە لە ڕێگای هاوبەش بڕیاردان‌و گومڕایدا هەن .
پاشان ئەو حەقیقەتە ڕاست‌و ڕەوان‌و بەرزە بزانە کە ئەم ئایەتە پیرۆزە دەری دەبڕێ‌و ڕایدەگەیەنێ کە دەفەرموێ :

**« وما امر الساعة الا كلمح البصر او هو اقرب »**

( سورة النحل/٧٧ )

پرسیاری سێ‌هەم :

ئەم مرۆڤەی کە لە پێشدا دوژمنایەتی لەگەڵ ئیماندا دەکردو ئێستا بۆی شادبووە ، دەڵێ :

« فەیلەسووفە گەورەکانی سەردەم دەڵێن : هیچ شتێك لە بوونەوە بەرەو نەبوون ناڕوات‌و لەناو ناچێت ، وە لە نەبوونیشەوە هیچ شتێك دروست ناکرێت ، کە ئەمەش بە ڕستەی : « المادة لا تفنى ولا تستحدث» دەردەبڕن » هەروەها دەڵێن : هەرچی‌یەك لە بوونەوەردایە تەنها بریتی‌یە لە پێکهێنان‌و شێتەڵ بوون » .

وەڵام :

فەیلەسووفە گەورەکان لە ڕوانگەی نووری قورئانی پیرۆزەوە نەیانڕوانیوەتە بوونەوەران . کاتێکیش کە لە کلاوڕۆژنەی « سروشت » و « هۆکان »ەوە بۆیان ڕوانیوە ، بۆیان دەرکەوتووە کە : هاتنەدی‌و یەکگرتنی ئەم بوونەوەرانە لە ڕێگای سرووشت‌و هۆکانەوە نەگونجاو و پڕ لە گیروگرفتە ـ وەك ئەوەی کە ئێمە پێشتر باسمان کرد ـ جا لەبەر ئەمە ئەم فەیلەسووفانە لەم مەسەلەیەدا بوون بە دوو بەشەوە :

بەشی یەکەمیان : بوون بە « سۆفسطائی » ، وە دەستیان بە تەواوی لە عەقڵی خۆیان داشۆرد ، ئەو عەقڵە هەستیارەی کە مرۆڤی لە ئاژەڵ پێ جیاکراوەتەوە . ئەم بەشەیان کە ئەم ڕێگەیان گرتەبەر ، کەوتنە ئاوەندی بێ عەقڵی‌یەکی زۆر پەست‌ترو نزمترەوە لە بێ عەقڵی‌ی ئاژەڵان . چونکە سەیریان کرد ئینکاری کردنی بوونی بوونەوەران‌و بوونی خۆیشیان ، بە لای عەقڵەوە لەوە ئاسانترە کە کاروباری بەدیهێنان بە دەست سرووشت‌و هۆکانەوە بێت ـ هەروەك گومڕایان لەو باوەڕەدان ـ بەم جەشنە ئەم بەشەیان لەسەر لوتکەی کەماڵی عەقڵەوە بەرەو لێتاوی نەفامی‌ی موتڵەق کەوتنەڕێ‌و شۆڕبوونەوە .

بەشی دووهەمیشیان ، کاتێ لە گۆشەی سرووشت‌و هۆکانەوە سەیری بوونەوەرانیان کردووە ، لایان وابووە کە ئەو سرووشت‌و

هۆیانە بەدیهێنەری ئەو بوونەوەرانەن ـ هەروەك لە گومڕایدا ئەم ڕایە شتێکی باوە ـ بەڵام سەرنجیان داوەو بۆیان دەرکەوتووە کە بەدیهێنانی شتێکی تا بڵێی بچووکی وەك ( مێشوولە ) یان ( تۆو ) چەندین گیروگرفتی لە ژمارە بەدەری تێدایەو پێویستی بە توانستێك دەبێت کە عەقڵ پەیی پێ نەبات ، لەبەر ئەوە خۆیان بە ناچار زانیوە کە ئینکاری‌ی خودی بەدیهێنان بکەنو بڵێن : « هیچ شتێك لە نەبوونەوە بەدی ناهێنرێت » ، پاشان لایان وابووە کە لەناوچوونی هەرشتێکیش مەحاڵە ، ئیتر بڕیاریان داوە کە « هیچ شتێکی خاوەن « بوون » لە بوونەوەردا لەناو ناچێت » ، وە بە خەیاڵی خۆیان دەبوونەی بوونەوەریان بە چەند بارو دۆخێکی ئیعتیاری‌ی وەك ( شیتەڵ کردنو کۆکردنەوە ) لێك داوەتەوە ، کە ئەتۆمەکانی بوونەوەرو تەووژمەکانی ڕێکەوت (الصدفة) بەرهەمی دێنن !

دەسا تۆیش وەرەو سەرنجێکی ئەوانە بدە کە خۆیان لە لوتکەی ئاقلاّندا داناوە ، سەیرێکیان بکەو بزانە لە چ چاڵو شیوو دۆڵێکی بێ عەقڵی‌دا دەگەوزێن ! لەمەیشەوە ئەوە بزانە کە چۆن ڕێگای گومڕایی ( الضلالة ) وا لەم مرۆڤە ڕێزلێگیراوە دەکات کە دەیخاتە ناو هەڵوێستی اوا گاڵتە پێکراو و سەرشۆڕی‌یەوە ، وە چۆن بەرەوخوارو ڕووەو نەفامی‌یەکی ڕووت باڵی پێوە دەنێ‌و دەیخاتە خوارەوە .. سەیرێکی ئەمە بکەو سەرنجی لێ بدەو ئنجا پەندی لێ وەربگرە !

پاشان ئایا چ شتێك لە توانستی ئەو کەسەوە بە دوور دەزانێ کە لە هەموو ساڵێکداو لە سەر ڕووی زەویدا چوار سەد هەزار جۆری زیندەوەر بەدی دەهێنێ ، ئەو کەسەی کە هەموو ئاسمانەکانو زەوی لە ماوەی شەش ڕۆژدا دروست دەکاتو ، لە هەموو بەهارێکیشدا کەونێکی

زیندووی نوێ ـ کە لە هەموو کەون زیاتر ووردەکاریو حیکمەتی پێوەدیارە ـ لە ماوەی شەش حەفتەدا دروست دەکات .. ئەو خواوەندە بەدیهێنەرو بە توانایەی کە بە توانستی خۆی هەموو ئەو بوونەوەرانەی کە لە زانستی خۆیدا ئەندازەیان دیاری کراوەو نەخشەیان کێشراوە ، بەو بەرپی ئاسانی یەوە دروست دەکات ، وەك ئاسانیی دەرخستنی نووسراوێکی نەبینراو تەنها بە هێنانی ماددەیەکی کیمیایی تایبەتی بەسەریدا .

جا ئیتر بە دوور زانینی بەخشینی بوونی خاریجی بەو بوونەوەرانەی کە لە زانستی خوادا نەخشەیان کێشراوە ، بە دوورزانینی ئەمە لە توانستی ئەزەلیی خواو ، پاشان ئینکاری کردنی خودی بەدیهێنان ؟ زۆر لە نەفامیو بێ عەقلیی سۆفسطائییەکان بێ عەقلیترو نەفامیترە .

(نەفس)ی ئەو سەر لێشێواوانە ، کە تا بلێی کۆڵەوارو بێ دەستەلاتن ، لە سنووری خۆیان دەرچوونو ئیددیعای فیرعەونیتی دەکەن . جا کە سەرنج لە خۆیان دەدەنو دەبینن لەناوبردنی هیچ شتێكو بەدیهێنانی هیچ شتێکیان لە توانادا نییە ، چ ئەتۆمێك بێت ، یان هەر ماددەیەك کە لە ( نەبوو ) و هیچەوە دروستی بکەن ، وە کە دەبینن سرووشتو هۆ ماددییەکانیش ، کە ئەوان پاڵیان پێوە داوەتەوەو شانازیی پێوە دەکەن ، ئەوانیش کۆڵەوارنو ناتوانن هیچ شتێك لە نەبوونەوە دروست بکەن .. کاتێك ئەمانە لێك دەدەنەوە ، نەفامیو بێعەقڵیان دەگاتە ئەو ڕادەیەی کە دەڵێن : « المادة لا تفنى ولا تستحدث » واتە ماددە نە لەناو دەچێو نە دروست دەکرێ . وە دەشیانەوێ ئەم قاعیدە هەڵەو ناڕەوایە لە هەموو شتێکی تردا بڵاو بکەنەوە ، بە ڕادەیەك

کە دەیانەوێ تواناى خواوەندى خاوەن توانستى ڕەهایش بخەنە ژێر ڕکێفى ئەو قاعیدە هەڵەو ناڕەواو ساکارەیانەوە .

بەڵێ ، خواوەندى خاوەن توانسى ڕەهاو ذونجەلال ، دوو جـۆر بەدیهێنان بەکار دەهێنێ .

یەکەمیان : بەدیهێنان‌و دروست‌کردن ( الاختراع والابداع ) واتـە لە نەبوون‌و لە هیچـەوە « بوون » دەبەخشێ بەو شتەى کـە دروستى دەکات ، وە هەرچێکیش ئەو بەدیهێنراوە پێویستى پێ‌ى هەیە ، هەر ئـەو خوایە لە نەبوونەوە بۆى بەدى دەهێنێ‌و پێشکەشى دەکات .

دووهەمیان : بە بنیات‌نان‌و سەنعەت . واتە بۆ مەبەستى دەرخستنى کەماڵى حیـکمەتى خۆى‌و ، بۆ دەرەوشاندنەوەى زۆربەى ناوەجوانەکانى خۆى‌و ، بۆ غەیرى ئەمانەیش لە حیکمەتە زۆرو ووردەکانى خـۆى ، هەر لە ماکەکانى بوونەوەر ، بەشێك لە بوونەوەران بەدى دەهێنێ . پاشان بە پێ‌ى یاساى «ڕۆزى پەیدا کردن» ئـەو ماددەو ئەتۆمانەى کـە گوێ ڕایەڵى فەرمانەکانى ئەو خوایەن ، دەیانێرێ بۆ ئەو بوونەوەرەى کە لە ماکەکـانى بوونەوەر بنیادى ناوون ، وە ئەو ئەتۆم‌و مـاددانە دەکـاتە گوێ‌ڕایەڵ‌و خزمەت گوزارى ئەو بوونەوەرە .

بەڵێ ، خواوەندى خاوەن توانـستى ڕەها دوو جۆر بەدیهێنان بەکار دەهێنێ کـــە لـە شێوەى : « بەدیهێنان » و « بنیادنان » دان . کـەواتە لەناوبردنى شتـێکى « بوو » و بەدیهێنانى شتـێکى «نەبوو»ى زۆر بەلاوە ئاسانە بـگرە ئەم یاسایە یاساى کارگێڕى خواوەندە لە گەوندا .

جا ئیتر ئەو کەسەى کە لەناوبردنى ئەو بوونەوەرانەى کـــە لـــە بەهـاراندا خـوا بەدیان دەهێنێ ، لـەو توانستەى بە دوور بزانێ کە لە

هــەموو بەهارێـکدا سێ‌سەد هــەزار جۆر زیاتر لــە بوونەوەران‌و زیندەوەران دروست دەکات‌و ، شکڵ‌و شێوەو سیفەت‌و چۆنێتی‌و حاڵەت‌و بـگرە دروست کردنی گەردیلەکانیشیان لە نەبوونەوە بەدی دەهێنێ • • ئـەو کەســەی « بەدیهێنان » و « لەناوبردن » لەم توانستەوە بــە دوور بزانێ‌و بڵێ : ئەو توانستە ناتوانێ لە نەبووەوە هیچ شتێك دروست بکات ؟ مانای وایە دەبێ ئەو کەسە خۆی لەناو ببرێ !

ئەم مرۆڤەی کە وازی لە « سرووشت » هێناو ڕێـگای « حەقیقەت »ی گرتە بەر ، دەڵێ :

**« بەئەندازەی هەموو ئەتۆمەکان سوپاسی زۆرم پێشکەشی خوای خۆم دەکەم • ئەو خوایەی کـە یارمەتی‌ی دام ئیمانم دەستگیر بێ‌و لــە هەموو وەهەو گومرایی‌یەکیش دەربازی کردمو ، ئیتر هەموو شوبهەو گومانەکانم لەناوچوون نەمان » •**

# نووسەر لە چەند دێڕێکدا

★ مامۆستا « سەعیدی نوورسی » لە گوندی (نوورس)ی نزیکی دەریاچەی ( وان ) لە ڕۆژهەڵاتی تورکیا لە ساڵی ۱۲۹۳هـ/۱۸۷۳ ز لە دایك بووە .

★ هەر لە منداڵی‌یەوە زیرەکی‌ی پێوە دیار بووە ، لە لای زانا بەناوبانگەکانی سەردەمی خۆی زانستە ئیسلامی‌یەکانی خوێندووەو دەستێکی باڵای لەو زانستانەدا پەیدا کردووەو ، لە تەمەنی (چواردە) ساڵیدا بڕوانامەی (عالمی)ی وەرگرتووە .

★ زانستە نوێ‌یەکانی سەردەم سەرنجیان ڕاکێشاوە ، لەبەر ئەوە لە ساڵی ۱۸۹۳زدا لە شاری ( وان ) دەستی کردووە بە لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی ئەو زانستانەی وەك : ( بیرکاری ، فەلەك ، کیمیا ، فیزیا ، زەوی ناسی .... هتد ) وە لە هەندێکیشیاندا کتێبی داناوە .

★ لەبەر ئەم زیرەکی‌یە بۆ هاوتایەی ناوبانگی بە ( سەعیدی مەشهوور ) و ( بدیع الزمان ) بڵاو بووەتەوە .

★ لە کاتی هەڵگیرساندنی جەنگی جیهانیی یەکەمدا کراوە بە فەرماندەی هێزە پارەمەتی دەرەکان کە لەقوتابییەکانی خۆیو خۆبەخت کەران پێك هاتبوون ، وە لە چەندین جەنگدا لەگەڵ ڕوسەکانا بەشداریی کردووە ، وە بەوڕادەیەك ئازایەتیی تیا نواند بوو کە سەرنجی فەرماندە سوپاییەکانی ڕاکێشابوو .

★ لەم جەنگەداو لە کاتی بەرگری کردندا لە شاری « بەدلیس » بریندار کراوەو ڕووسەکانیش بە بریندار دیلیان کردووە ، پاش دوو ساڵو چوار مانگ دیلی لە ( سیبیریا ) هەڵهاتووەو گەڕاوەتەوە بۆ ئەستەمبوڵ . وە لەوێ کراوە بە ئەندامی « دار الحكمة الاسلامية ) کە بالاترین کۆڕی زانیاریی ئەوسای دەوڵەتی عوسمانی بووە .

★ پاش چەند ساڵێك ئەستەمبوڵی جێ هێشتووەو گەڕاوەتەوە بۆ ( وان ) ، وە لەوی لەسەر چیای (ئەرەك)دا دەستی بە خواپەرستی کردووە .. لێرەوە بەشی دووهەمی ژیانی دەست پێ دەکات ، خۆی ئەم بەشەی ژیانی خۆی ناوناوە قۆناغی « سەعیدی نوێ » . لەم بەشەی ژیانیدا خۆی بۆ ڕزگارکردنی «ئیمان» تەرخان کردووە .

★ لەساڵی ١٣٤٤هـ / ١٩٢٦ز ڕەهەندی گوندی « بارلا » کراوە ، کە دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای تورکیا ، هەشت ساڵو نیو لەوێ ماوەتەوە . زۆربەی پەیامەکانی نووریشی لەوێ داناوە .

★ پاش « بارلا » ، لە چەند جێگایەکی تری وەك شاری «قەستەمۆنی»و « ئەمیرداغ »دا ژیانی بە ڕەهەندەییو دەست بەسەری بەسەر بردووەو ئەمانەش چواریەکێکی ژیانی داگیر کردووە .

★ لــە نێوان ساڵەکانی ١٩٢٦ تا ١٩٥٠ز ، زیاتر لـە (١٣٠) پەیام (رسالة)ی بە زمانی تورکی داناوە ، جگە لەو (١٥) پەیامـەی کـە پێش ئەم مێژووە بە زمـانی عـەرەبی دایـنـابوون • ئـەم کتێبو پەیامانەش بـــە گشتی بـــە (مەوسووعە)یەکی ئیمانیی گرنگ دادەنرێنو پێویستیی ئەم سەردەمەی ئیمانداران بەجێ دەهێنن •

ئـەم پەیامانەشی ناوناوە بـە ( رسائل النور ) واتە پەیامەکانی نوور ، چونـکە لـە ڕووناکیو نووری قورئانی پیرۆز هـــەڵی گۆزیون •

★ لـە شـەوی قەدری پیرۆزی مانـگی ڕەمـەزانی ساڵی ١٣٧٩هـ بەرامبـەر بـە ١٩٦٠/٣/٢٣ز لـە شاری ئورفەدا کۆچی دوایی کردووەو هەر لەوێش نێژراوە • پاشان بە فەرمانی کاربەدەستان لە گۆڕەکەی دەرهێنراوەو لە جێگایەکی نەزانراودا نێژراوەتەوە •

هەزاران سڵاو لە گیانیبێو خوای گەورەش لێیخۆش بێو بە پلەی بەرزی بەهەشتی بەرین شادی بکات •

( وەرگێر )

ئاگاداری‌یه‌ك

وه‌رگێڕ جگه له‌م په‌یامه چه‌ند په‌یامێکی تری له په‌یامه‌کانی نوور کردووه به کوردی :

١ ـ په‌یامی بیماران ( چاپکراوه )

٢ ـ په‌یامی پیران ( چاپکراوه )

٣ ـ ووته بچووکه‌کان ( چاپکراوه )

چه‌ند به‌رهه‌مێکی تریش به‌ڕێوه‌یه به یارمه‌تی‌ی خوا لــه چــاپ ده‌درێن ٠

# رسـالة الطبيعـة

من كليات رسائل النور التي الفها : بديع الزمان سعيد النورسي

ترجمها من العربية الى الكردية : فاروق رسول يحيى



# THE NATURE LETTER

By : Bediuzzaman Said Nursi

Translated by : Faruq Rasul Yahya

---


له كتێبخانەی نیشتمانیی بەغدادا

ژمارە (٤٢٨)ی سالی ١٩٨٦ی دراوەتێ

★ ئایا سرووشت :
هونەرە یان هونەرمەند ؟ شوێنەوارە یان کاریگەر ؟ هۆنراوەیە یان هۆنەر ؟ یاسایە یان یاسادانەر ؟

★ ئایا بە پێی تەرازووە عەقلی‌یەکانی مرۆڤ چەند ڕێگا هەن بۆ دۆزینەوەی بەدیهێنەری ڕاستەقینەی بوونەوەر ؟ ئایا بە پێی هەمان تەرازووی عەقلی کامیان ڕاستە ؟

نرخی (٧٥٠) فلسە

مطبعة الحوادث ـ بغداد ت ٤١٥٢٦٨٥